


00964 770 652 1662

## ناسنامەی کتێب


- ناوی کتێب : لەیلان
- بابەت: کۆمەڵایەتی
- نووسینی : کاروان خۆشناو
- پێداچوونەوەو هەڵەچنی: کامەران خۆشناو
- تایپ: رێدار دلاوەر
- نەخشەسازی : نووسینگەی هیوا
- تیراژ (١٠٠٠) دانە
- چاپی یەکەم ، هەولێر / ٢٠١٥

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارە سپاردنی ( ٤٦٢ )ی
ساڵی (٢٠١٥)ی دراوەتێ

# پێشکەشە...

بـــەو نەخوێنـــدەوارەی هـــەموو مرۆڤایـــەتی فێرکـــرد... پێـــشەواو ســـەروەرم موحەممـــەد (درودی خـــوای لەسەر بێ).

کاروان

# پێشەکی

وەك دەڵێن ژیان باشترین مامۆستایە، لە ماوەی کارکردنم لە ڕیزی هێزەکانی ناوەخۆ بۆ ماوەی زیاتر لە بیست ساڵ، سەدەها چیرۆکی جۆراوجۆرم بینیووە، ڕووداوی ڕاستەقینەی سەرسوڕهێنەری ئەو تۆ کە دەکرێت لەژیاندا وەکو وانەی پڕاکتیکی ئەژمار بکرێن، ئەم نۆ چیرۆکەی لەدوو توێی ئەم نامیلکەیە یاداشت کراون ، مشتێکن لە خەرمانەی ڕووداوەکانی ژیان، ئەوەی هەموویان کۆدەکاتەوەئەوەیە، کەلەسەرەتادا کەسی خاوەن چیرۆك (نامەوێت بلێم تاوانبار)، بەدوای لەیلان و سەراب و بەردە تەڕاویلکە دەڕوات و وا دەزانێ ڕاستەقینەیە، کەچی دواتر بۆی دەردەکەوێت، کەبەدوای شتی پووچ و وەهمدا ڕۆیشتووەو لەئاکامدا هەر خێر و چاکەو ڕاستی سەردەکەوێت......

خوای گەورە مەودا دەدات بەڵام هیچی لەیادناچێت و فەرامۆش ناکات.

ئەم چەند چیرۆکە پێشکەشە بە هەموو خوێنەران و

سوودی لی وەرگرن و هەوڵدەن خۆیان لە خراپەکاران و بیری کرچ و کاڵ بەدوور بگرن و بەدوای کەسایەتی خۆیان بگەڕێن، نەکەن بەدوای لەیلان و سەراب بکەون.

لە کۆتاییدا داوای لێبوردن دەکەم لە هەر کەم و کورپیەك چونکە ئەمە ئەزموونی یەکەممە لە بواری نووسیندا و تەنها ئامانج بە دوایەوە خستنە ڕووی ئەم ڕووداوانە بووە بۆ بەرچاو ڕوونی خوێنەری بەڕێز و پەند وەرگرتن لێیان......

**کاروان خۆشناو**

هەولێر ـ ٢٠١٥

لەیەکێك لەکۆلێژەکانی وڵات قوتابییەکی زیرەك و لێهاتوو بووم، خاوەن ڕەوشت و کەمێك بەجوانی خۆم دەمنازی، بۆیە تێکەڵ کەس نەدەبوومو تەنانەت هاوڕێیەتی کەسم نەدەکرد.

باوانم زۆریان خۆش دەوەیستمو زۆر بەکچە بەڕەوشتو ژیرەکەیان سەر بەرزبوون .

ڕۆژێکیان لەکۆلێژ هاتمەدەر، گەنجێك وەستابوو سەیری دەکردم، وەك ئەوەی بڵێی ناسیاو بێ، زۆرم گوێ پێنەدا، کەچی بەدوام داهات و قسەی خۆشی بۆ دەکردم، منیش ئاوڕم لێی نەدایەوە، دەیگوت ماوەیەکە چاودێریت دەکەم و چوویتەدڵم و منیش هەر وەڵامم نەدایەوە.... کەچی ئەو هەر بەدوامەوە بوو دەیگووت:

تۆ زۆر بەڕەوشت و جوانی، نیازم پاکە مەودا بدەڕازی دڵمت بۆ بڵێم...... منیش هەر سەرم بڵند نەکرد لەشەرما هەنگاوەکانم خێراتر دەکرد و ئارەقەیەکی سارد بەڕوما دەهاتە خوارەوە، کە گەیشتمەوە ماڵەوە هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا، بەڵام تا بەیانی خەوم لێنەکەوت، نازانم لەترسان بوو یان لە خۆشی قسەکانی!

دەکرێ من خەونی یەکێك بم و بەم شێوەیەخۆشی ویستبم و

نەمزانیبێ؟

وام زانی مەسەلەکەهەر بەوە کۆتایی دێت، کەچی ئـەو هـەر کۆڵی نەدا و بـەردەوام هەراسـانی دەکـردم، هەڵـەی مـن ئـەوەبوو لەسەرەتاوە بەکەس لەبرا و خزمانم نەگووت، وەکو ئـەوەی بلێـی لەناخەوەحەزم لەمەسەلەکەبوویێت بەوەی گەنجێك خۆشـی بـوێم و بمکاتەخێزانی داهاتووی و کابانی ماڵەکەی..

ڕۆژێکیـان لـەنزیك ماڵمـان کاغـەزێکی بـۆ فڕیـدام و منـیش بەدەســتی لەرزۆکــەوەو بەهەســتێکی تــێکەڵاوی خۆشـــی و ناخــۆشی، هەسـتێـك پـــڕ لـەتـــرس و دڵـەڕاوکـــێ تـێکـــەڵ بـەخـۆشـییـەکـی نـامـۆ بـەم کـارەگـەنـجـانـە هەڵم گرتەوە.

بە هەر حاڵ نامەکەم خوێنـدەوە کـەلێوان لێـو بـوو لەوشـەی ئەوین و دڵداری، پـڕبـوو لەهیوا و ئـومێد و بـەڵینی ئەفـسونـاوی. هیچم بۆ نەکرا و لەترسـی بینـینی نامەکەلـە لایـەن کـەس و کـارم یەکسەر سوتاندم و بەمەش وامـزانی ئەم لاپەڕەیـەم لـە ژیانــم دا بـۆ هــەتا هــەتا سوتـانــد و سـبەی بـەیانی لاپەڕەیـەکی نـوێ دەکەمـەوە. کەچـی ئەفـسوس دوای چـەند کاتـژمێرێك بـەمۆبایل پەیوەندی پێوەکردم لەکاغەزەکەی پرسی. منیش زۆر بـەتوڕەیی هەڕەشەی ئەوەم لێ کـرد کەئەگـەر واز نـەهێنێت ئــەوا ئاگـاداری

خانەوادەکەم دەکەم و ناچارم پێیان بڵێم کەئازاری بدەن و بەتورەیی پەیوەندیەکەم پچڕاند. کەچی دوای دوو کاتژمێر دووبارەپەیوەندی پێوەکردمەوە و بەگریانەوە داوای لێبوردنی دەکرد و دەپاڕایەوە کەبەبێ من ناتوانێت بژێت و نیازی پاکەو تاقانەی دایك و باوکیەتی و چی تیایە ئەگەر ماوەیەك بەر لەخواستن یەکتر بناسین و شارەزای یەکتربین؟ بەگریانەوە دەیگووت: بێ تۆ ناتوانم بژیم، دەمرم گەر وەڵامم نەدەیتەوە، ئێمەخانەوادەیەکی خواپێداوین و هەر زوو بەزوو دێمەخوازبینیت.........

لەئاست ئەم قسانەدا دڵم نەرم بوو، مادام نیازی پاکە چی تێدایە ئەگەر ماوەیەك بەیەکەوە بین؟

خۆ ئەم گەنجە دەوڵەمەندە دەمکاتەکابانی تەلارێکی گەورەو هەموو ئاواتەکانم بۆ دێنیتەدی........ بەم قسانە دڵی خۆم ڕازیکرد لەم شەوەبەدواوەزۆر قسەمان بەیەکەوەکرد........ تا وای لێهات کەوتەدڵم و خولەك بەخولەك چاوەڕێی زەنگی مۆبایلم دەکرد و دەنگی ببووەمایەی ئاسودەیی و کامەرانی، کە لەکۆلێژ تەواو دەبووم وەکو شێتێك چاوم بۆی دەگێڕا کە

بەسەیارە دەربچین و ڕازی دڵی خۆمی بۆ بگێڕمەوە........ تا ئەم ڕۆژەشـــوومەهات، کـــە هـــیچ جیـاوازیـەکـــی لـەگـــەڵ ڕۆژانـــــی دیکەنـــەبوو، زۆر بەکـــەیف و خۆشـــی پێـــشوازیم لێـــی کـــرد، و بەیەکـەوە سـواری ئۆتۆمبێلەکـەبووین، هەمـدیس بـۆ مــاوەیەك بـەئۆتۆمبێل گەڕاین، بەردەوام دەیگۆت:

هەر تۆم هەیەلەدونیا کەی ئەم ڕۆژەدێ ببیەهاوسەرم؟

منیش زۆر متمانەم پێیەوەهەبوو، ئەو ڕۆژەمـنی بردەمـاڵێکی چۆڵ گـوایەمـاڵی خۆیـانـە.......... ماوەیەك بەیەکەوەدانیشتین و قسەمان کرد، لەناکاو دەستی گرتم و سەیری ناو چاوانمی کـــرد و گـووتـی خـۆشم دەوێـی مـنـیش سەیری ناو چاوانیم کرد و گـووتم منیش خۆشمدەوێی. دواتر خۆم لەبـیرچوو و ئـاگـام لـەخـۆم نەما کەوەکو نـێـچـیرێکی بـەسـتـەزمان کەوتمەتەڵـەی ڕاوچـــیەکی بـــێ ڕەوشت. کـاتێ بـەهـۆش خـۆم هاتمـەوە، بـەنرخترین شـتی خـۆم لەدەست دابوو، ئەو شتەی کەلەم وولاتەدا بەشەڕەف دەناسـرێت و زۆر بەسانایی مرۆڤی لەسەری دەکوژرێـت.....

وەك شـێتێك هەڵسامەوە و دەستم کردەگریان ووتم:

چیت پێمەوەکرد؟؟

زۆر گریام..... کەچی ئەو دڵی دامەوەو گووتی:

مەترسیٚ من مێردی تۆم.........

وتــم: چـۆن؟ خـۆ تـۆ مـنـت مـارەنـەکـردووە؟

وتی: مەترسەگیانەکەم! بەم نزیکانـەمارەت دەکـەم و بەیـەك شاد دەبین.

ئەو ئـێـوارەیـەزۆر بـەشـپـرزەیـی گـەڕامـەوەماڵەوە، نەمتوانی هیچ بخوێنم و گریام و هـەر لـەخۆم دەدا....خانەوادەکـەم نـەیان دەزانی هـۆکاری ئـەم حاڵـەتـەچیـە؟ مـنیش وەکو شـێتان خـۆمم دەخواردەوە، و هـەر چـاوەڕێی زەنگێکـی پەیوەنـدی ئـەو بـووم، کەچی هیچ دەنگی نەبوو.

دوای چەند ڕۆژێك پەیوەندی پـێـوەکـردم بۆ ئەوەی بمبـینیٚ، منیش زۆر دڵخۆش بوومو لەخەیاڵ هەزار تـابلۆی ڕەنگـاو ڕەنگـی هـاوسـەرگـیـریـەنـزیـکـەکـەم دەنـەخـشـانـد و بـیـرم لای تــارای سـپـی بـوکـێـنـی بـوو...........

کەچی زۆر بەفیز و لەخۆباییەوە هات گووتی:

مــن بــەڵێنی هــیــچم پــێــت نـــەداوە، ئـەسلــەن زۆرم لـــیٚ نـەکــردی و خــۆت حــەزت لـــیٚ بـوو...... بـیر لەهاوســەرگیری مەکەوە، با بـۆ خـۆمان بـەمشـێـوەیـەوەکـو دوو بـرادەر بـژیـن و چـیمان داوەلەهاوسەرگیری؟

زۆر توڕەبووم و زلەیەکم لێدا و گووتم:

وامدەزانی کەهاتووی هەڵەکانت چاك بکەیتەوە، بەڵام وا دیارەتۆ دڕندەی نەوەك مرۆڤ...... ڕقم لێتەهەی نامەرد........ بەگریان و بەپەلەلەئۆتۆمبێل دابەزیم...

وتی: ڕاوەستە...

گووتم: بۆ ڕاوەستم؟ تۆ ئەسڵەن پیاونیت.....

گووتی: ڕاست دەکەی، بەڵام دەتوانم ژیانت تێك بدەم (لەم کاتەدا مۆبایلەکەی بەرز کردەوە).

گووتم: یەعنی چی؟

گووتی: وەرە خۆت سەیرکە، تەواوی ڕووداوەکەم تۆمارکردووەو ئێستا ئەگەر بەقسەم نەکەیت ژیانت بەیەك خولەك دەفەوتێنم.....

گووتم: ئەی کوا خۆشەویستیەکەت؟ ئەی کوا بەڵێن و پەیمانت؟

گووتی: بەخوا دەبەنگی، خۆشەویستی چی، من هەر دەمویست بەتۆ بگەم و لەشیلاوی جەستەت بنۆشم، کەی من

هی هاوسەرگیریم؟

گووتم: تو خوا، وازم لێبێنە.

گووتی: تازەکار لەکار ترازاوە.......... دەبێ هەموو قسەکانم جی بەجێ بکەی...

منیش لەترسی ناوزڕاندن و حەیا چوون بەگەڵی کەوتم و وازم لەهەموو شتێك هێنا و لەم ساتەوە بوومە کۆیلە و کەنیزەی ئەو، بەکەیفی خۆی ئەودەست ئەو دەستی پێ دەکردم و هەر ڕۆژێ دەیخستمەباوەش پیاوێکی ناپیاوی هەوەس باز، بەرامبەر بەبڕیك پارەئەم کارەی پێ دەکردم... بەتەواوی ژیانم گۆڕاو لەکچیکی بەڕەوشت و خوێندکارێکی زیرەکی زانکۆ، بوومەئافرەتێکی سووزانی بەد ڕەوشت بەبێ ئەوەی خانەوادەکەم هیچ بزانن.

تا لەناکاو یەکێك لەگرتە ڤیدۆییەکانی کارەبەد ڕەوشتیەکانم بڵاوبۆوەو گەیشتەدەست یەکێك لەئامۆزاکانم و باوکم پێی زانی و لەتاو ڕیسوابوون خێزانەکەم لەگەڕەك باریان کرد. منیش لەترسان نەگەڕامەوەماڵ، لەم کاتەدا دایکم لەتاوی کارەساتەکەو لەداخان بەدڵەکوتەچووەبەر میهرەبانی خوای دلۆڤان. منیش لەبەر بێکەسی و کەساسی ژیانم لەگەڵ

ئافرەتەبەدڕەوشتەکان بەسەر دەبرد و ئەم دڕندەیەش منی کردبووە بووکە شووشەو هەر شەوەی منی دەکردە شاباشی هەوەس بازێکی بێ بەزەیی و شەڕوال پیسێکی بێ ئابڕوو. ئەم تاوانەی ئەو بەمشێوەیە بەردەوام بوو.

لەم ماوەیەدا لەچەند کچی دیم بیست کەبەهەمان شێوەی من کەوتوونەتەداوی ئەم شەیتانەو ئەوانیشی بە دەردی من بردووەو شیرازەی خێزانی ئەوانیشی وەکو خێزانی من تێکداوە، بۆیەبڕیارمدا کەهەر کات بۆم بلوێت تۆڵەی خۆم و ئەم کچەبەستەزمانانەلێبکەمەوە......

شەوێکیان زۆر درەنگ بەسەرخۆشی هاتە لام، ئەوەندەی خواردبۆوە ك ەنەی دەتوانی بڕوات، بۆیە هەڵکەم قۆستەوەو دامەبەر چەقۆ و تۆڵەی کۆمەڵگەم لێی کردەوەو جیهانم لەتاوانە قێزەوەنەکانی ئەم دڕندەیە رزگار کرد.....

دواتر پۆلیس دەستگیری کردم و بە دەساڵ زیندانی سزا درام، لەزیندان بووم کاتێ زانیم باوکم بەم حەسرەتە سەری ناوەتەوەو گیانی سپاردووە.

باوکم هەمیشەدەیگووت: ( خوا پشت و پەنامانەو باشترین یاریدەدەرە((حسبنا الله ونعم الوكيل)) تا ڕۆژی

دوایی لە کچەکەم توڕەم و گەردەنی ئازاد ناکەم).

دەزانم هەمووی خەتای خۆم بوو، من کە بە دووای لەیلان و سەرابەوە کەوتبووم و وامزانی خۆشەویستی راستەقینەیە، دەبوایە بمزانیبایە لەخواترس بێتو پیاو بێتو ئەوەی خۆشەویستی بکات قەت هەڵە ناکات و ئەوەی هەڵە دەکات ئەوە ئەسڵەن هیچی لە خۆشەویستی نەزانیووە. دەبوایە بزانم جیاوازی نێوان پیاوی و کەسی نامەرد چیە، من خۆم مەڕ بووم و بەپێی خۆم چوومە لانەی گورگەوە، من بە ساکاری و کەمزانی خۆم هەموو شتێکم لەدەست دا. هیوادارم ئەوەی ئەم چیرۆکەم دەخوێنێتەوە سوود وەرگرێت... بەڵام تا ئێستاش وشەکانی باوکم لەگوێم دەزرنگێتەوەو قەد لەیادیان ناکەم و شەوانە بەدەم گریانەوە هەموو ئەم یادگاریانەم بیردیتەوەو وشەکانی باوکم هەموو شەو هەزار جار دەمکوژن.........

دلێر گەنجێکی روح سووك و فەرمانبەرێکی چالاك و لێهاتووبوو، لەیەکێك لەفەرمانگەمیریەکان کاری دەکرد، ئەرکی ڕۆژانەی خۆی زۆر بەسەرکەوتوویی ڕادەپەڕاند، هەرچەندەئەو فەرمانگەی کاری تیادا دەکرد بەهۆی مامەڵەکردنیلەگەڵ کۆمپانیا زەبەلاحەکانی بواری نۆژەن کردنەوەو بنیات نان، شوێنێکی بە کێشەو کارەکانی ئاڵۆز بوون.

بەهۆی قورسی باری دارایی و کەمی مووچەو دەست ڕۆیشتویی کۆمپانیاکان، بەشێك لەفەرمانبەرەکانی فەرمانگەکە(بەبەڕێوەبەرەوە) ئاسانکاری و چاوپۆشیان بۆکۆمپانیاکان دەکرد بەرامبەر بە(بەرتیل) و (دیاری) و (بەخششی جۆراو جۆری ماددی و واتەیی).

زۆر جار هاوکاران و تەنانەت خودی بەڕێوەبەر داوایان لە دلێر دەکرد کەواز لەو (کەلەڕەقیەبێنێت) و (ئاسانکاری) پێشکەش بکات و ئەویش وەکو ئەوان لەم (خێرە) زۆرەسوودمەند بێت، کەچی لەبەرامبەردا دلێر زۆر خۆڕاگر بوو، بەردەوام بەزەردەخەنەوە بە(نەخێر) وەڵامی دەدانەوەو لەکۆتادا دەیگووت (پیرۆزتان بێت ئەم پاروەچەورە حەڕامە، من ڕێجیم دەکەم حەزم لەچەوری نییە ! !).

ڕۆژگار هات و چوو، دلێر ژیانی هاوسەری پێکهێنا و ماڵی خۆی جیاکردەوەو بەهۆی کەمی مووچەو نەبوونی سەرچاوەیەکی دیکەی دارایی کەوتەتەنگژەو بەناچاری لەپێناو تەواوکردنی پرۆسەی هاوسەرگیری بڕێکی زۆر پارەی قەرزکرد، بەهیوای ئەوەی بتوانێ لەداهاتوودا بیانداتەوەو بەردەوام دەیگووت (مرۆڤ لەژیانیدا دووجار تووشی قەرز دەبێت جارێکیان لەکاتی ژنهێنان، دووەمیان لە کاتی خانوو دروستکردندا).

بەڕێوەبەری فێڵزان ئەم هەلەی قۆستەوە، و وەك ڕاوچیەکی مەعلان، خۆی حەشاردا تا دلێر وەکو نێچیرێك بخاتە داوی خۆی، سەرەتا بەدیاری خۆیی و هاوڕێ (بەرتیل خۆرەکان) دەستیپێکرد، دواتر هەر ڕۆژەو بەبیانوویێك و لەژێر ناونیشانێك دیارییەکەی دەخستە بەردەمی یاخود برەپارەیەکی پێدەدا. (ئەمەدیاریەکی ئاسایی کۆمپانیایە) و ( ئەمەشیرینی فلانەکەسە) و (ئەمەهی شەکراوە)....

دلێری زانا هەر زوو هەستی بەم کارەکرد و سەرجەمیانی ڕەت کردەوە، گووتی:

ئەم کارەراهێنانی خەڵکەلەسەر (بەرتیل) و( مفت خۆری)، من فەرمانبەرم و لە چوار چێوەی یاسا و بەپێی

ڕێنمایەکان کارەکانی خۆم ڕادەپەڕێنم، نەزیاد و نەکەم، بەڵام ئەوەی ئێوەدەیکەن لادانەلەهەموو یاسا و ڕێساکان.

دلێر بڕیاری دا لەڕێبازەکەی خۆی بەردەوام بێت بەڵام قەرز وەکو کەلەپچەکۆتی کردبوو، شەو تا درەنگ دیمەنی قەرز بەخشان کەداوای قەرزەکانیان دەکەن وەکو مۆتکەیەك یەخەی گرتبوو...

شەوێ لەخەودا لەدەریایەکی گەورەدامەلەی دەکرد و زۆر هەوڵیدا کەچی ماندووبوو و نەگەییەکەناری ئارامی و لەناکاو قەرزەکان وەکو قورسایی بەپێیەکانی نووسان و دلێریان بەرەو ژێر ئاوەکەدەبرد و ئەویش بەدەست لەئاوەکەی دەدا و هەوڵی دەدا ژێر ئاو نەکەوێت. لەم ساتەدا دلێر بەئاگا هات و هەستی کرد ئارەقەیەکی ساردی کردووە، تەماشای کاتژمێری کرد و بینی کەمی ماوەبۆ نوێژی بەیانی، دەست نوێژی شووشت و شەو نوێژی کرد و دوای نوێژی بەیانیش قورئانی خوێند و ئایەتێك زۆر سەرنجی ڕاکێشا، کە دەفەرموێت: {وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لا يَحْتَسِبُ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا} ﴿الطلاق: ٢- ٣﴾ - ((واتە: جا ئەوەی لە خودا بترسێت و

پارێزکار بێت، ئەوە خودا دە رووی لێ دەکاتەوە... لە شوێنێکەوە ڕزق و ڕۆزی پێ دەبەخشێت کە حسابی بۆ نەکردبێت و خۆی پێی نازانێت، جا ئەوەی پشت بە خودا ببەستێت، ئەو زاتەی بەسە، بۆ ئەوەی یاریدەدەری بێت، چونکە بەڕاستی خودا کارو فەرمانی خۆی بەئەنجام دەگەیێنێت، بێگومان خودا بۆ هەموو شتێك نەخشەیەکی دیاریکراوی بڕیارداوە (کە دەبێت پەیڕەو بکرێت)) ﴿تەفسیری ئاسان﴾.

جارێـــك و دووان و ســـیانی خوێنـــدەوە، دوای تـــەواوبوونی بڕیاریـدا دەســت لـــەکار هـــەڵگرێت و چـیتر لـــەکارەکانی لـــەم فەرمانگەیە بەردەوام نەبێت.

بـــەیانی زۆر بەئاســـودەیی چـووەفەرمانگەو داواکاریەکـــەی لەبەردەم بەڕێوەبەر دانا.....

بـەڕێـوەبـەر واقی وڕما لـەم بڕیـارەکتوپڕە، بـەڵام لەراسـتیدا زۆری پێخۆشــبوو بـــەوەی ئـــەم فەرمانبەرەهەراســانکارەڕێگرە، دەڕوات و دەتـوانێ یـەکێك لـەپیاوانی خـۆی لـەم شـوێنەدابنێت، بۆیەزۆر بەخێرایی واژوویکرد......

هـاوکارانـی زۆریـان لـەگـەڵـی هەوڵـدا کـەواز لـەم کارەبێنێـت بەوەی تازەژنی هێناوەبۆ ڕزق و ڕۆزی خۆی دەبڕێت و خـۆی نـان

براو دەكات، بەڵام لە وەڵامدا زۆر بەهێمنی دەیگووت (خـوا خـۆی ڕزق دەدەرە).

دوای وەرگـــرتنی ڕەزامەنـــدی لـــەسەر دەســـت لـەكـــار هـەڵگرتـنەكەی، دلێر بـەدوای كـار دەگـەڕا، تـا دواجـار برادەرێـك برێـك پـارەی بـە قـەرز پێـدا و ئـەویش دوكـانێكی كۆمپیوتـەری كردەوە و سەرقاڵی ئەم كارەبوو...

بـەهـۆی لێـهاتـوویـی و دەستـپاكیـەوەخـەڵك ڕوویان تێكـرد و لـە ماوەیـەكی كورتـدا تـوانی سـەرجەم قـەرزەكانی بداتـەوەو گوزەرانی خۆشتربكات.

دلێر لەكارەكانی بەردەوام بوو و بووەمایەی متمانەی خـەڵـك و فـەرمانگـەو چـەنـدین كۆمپانیای بـواری كۆمپیوتـەر، كـەدواجار یـــەكێك لـــە گـــەورەترین كۆمپانیاكـــانی كۆمپیوتـــەر دلێریـــان كردەبریكاری خۆیان و متمانەی تەواویان پێیدا......

ئەو ڕۆژەی دلێـر بریكاریەكـەی وەرگـرت، زۆر خۆشـحاڵ بـوو، كەچووەماڵ دوای نوێژی شەوان سوجدەیەكی سوپاسـگوزاری بـۆ خوا بردوو گوتی:

(مـیـهـرەبـانـەكـــەم، ســـوپـاس بـــۆ تـــۆ كـەهـێـــزت بـەمـــن بەخشی، ڕێی ڕاستت لـە بـەردەمم كـردەوە، بـیرت ڕۆشـن كـردم،

یارمەتیت دام کە بڕیاری ڕاست بدەم، وزەت پێدام و ئارامیت پێبەخشیم کەخۆڕاگر بم و لە بڕی ئەوەی فەرمانبەرێکی گەندەڵکار و بەرتیل خۆرێکی سەر نزمی کۆمپانیاکانی شار بم، بەسەر بەرزیەوە بوومە بریکاری گەورەترین کۆمپانیاکانی وولات.

زۆر سوپاس پەروەردگارە، من لەتۆ ترسام و خۆم خستەپەنای تۆ، تۆش دەرگای ڕزقێکی گەورەت لێکردمەوە....

وەستا خدر کابرایەکی دڵڕەق و ناشرین بوو، کەسێکی تووڕەو بێ ئارم، مرۆڤێکی بێ ویژدان و خۆپەرست، هیچ جۆرەهەستێکی مرۆڤایەتی نەبوو، بەردەوام بیری لەبەرژەوەندی خۆی دەکردەوە، چۆن بەزووترین کات زۆرترین بڕەپارەی دەست دەکەوێت و لەسەر هەوا و هەوەسی خۆی سەرفی بکات...

سەرجەم کرێکارەکان ڕقیان لێی دەبۆوە، بەڵام بەهۆی شارەزایی لەکارەکەی بەناچاری کاریان لەگەڵدا دەکرد، ئەوەندەی لێی دەترسان ئەوەندەخۆشیان نەدەویست، یەکێك لەو کرێکارانەی لەگەڵی کاری دەکرد جەوهەری کوڕی خوشکی بوو کە گەنجیکی سادەو بەتوانا بوو. کرێکارەکانی دیکە جەوهەریان زۆر خۆشدەویست و بەردەوام دەیانگوت:

تۆ زۆر لەخاڵەدڵڕەقەکەت جیاوازی.

جەوهەر زۆر متووی خاڵی بوو، بەردەوام لەگەڵی بووتەنانەت ئێوارەش هەر بەیەکەوەدەچوونەوە، چونکەدانیشتووی یەك گەڕەك بوون و تەنها چەند خانوویێك لێك دوور بوون.

بەیانیەك وەستا خدر ناچێتەسەر کار، بەڵام کرێکارەکان

کاری خۆیان دەکەن و جەوهەریش زۆر دڵی لای خاڵی دەبێت، بەر لە نیوەڕۆ جەوهەر لەسەر بیناکەوەبینی خاڵی وا بەخێرایی بەئۆتۆمبێلەکەی بۆ سەر کار دێت، یەکسەر بەپیلیەوەچوو، بینی وەستا زۆر بەشپرزەیی لەئۆتۆمبێلەکەی دابەزی و ڕەنگی تێکچووەو جەوهەریش بەڕاکردن، جامە ئاوێکی بۆ دەبا، ئەویش بەیەك قوم فڕی کرد، وەك بڵێی لەبیابانێکی دوورەوەهاتبێ، جەوهەر بەسەر سوڕمانەوەپرسی:

خێرەخاڵە؟ چیتە؟ خۆ چ ڕووی نەداوە؟

خاڵی زۆر بەتوڕەیی گووتی: هیچ نیەخوارزا، ئیشی خۆت بکە.

تا کاتی تەواو بوونی کار، جەوهەر هەر لە ژێرەوە بەنهێنی سەیری وەستای دەکرد، هەستی کرد خاڵی شتێکی بەسەر هاتووەو تەواو نیە، کەتەواو بوون جەوهەر هاتە لای خاڵی و گووتی:

وەستا چ هەیە بتەوێ پێمی بڵێیت؟ هیچ شتێك هەیەبتوانم یارمەتیت بدەم؟

خدر کەزانی خوارزاکەی هەستی بە شتێ کردووە، پێی

گوت: لەگەڵم وەرە...

بردیەلای بەرازیلیەتەکسیەکەی و سندقەکەی کردەوە. بەبینینی چەقۆی بەخوێن و هەندێ جل و بەرگ و چەند شەدەپارەیەك، جەوهەر ڕاچەڵەکی و ڕەنگی زەرد بوو، گەڕاوە دواوە، کەچی وەستا مەودای نەدا بیر بکاتەوە, یەکسەر پێی گووت:

زووبە،سواربەبا بڕۆین، جەوهەر بەترس و دوودڵیەوەسواری ئۆتۆمبێلەکە بوو، بەشپرزەیی گوتی:

ئەوە چیە وەستا؟

وەستا بێ ئەوەی سەیری بکات زۆر بە هێمنی وەلامی دایەوەو گووتی: مامەڵەم لەگەڵ کابرایەکی درۆزن هەبوو، پارەکەی خواردبوو نەیدەویست بیگەڕێنێتەوە.

جەوهەر: ئەوجا...؟ بەشەڕ هاتی لەگەڵی ؟

وەستا: نەخێر.......لە ناو ماڵی خۆی چوومەسەری و بەچەقۆ کوشتم و پارەکەی خۆمم بەزیادەوە هێنایەوە.

جەوهەر: کوشتت؟ باشەبۆ بەخۆشی لێت وەرنەگرت یەعنی

هـیچ چارەسـەری دی نـەبوو؟ بتگوتبایەلەگـەڵت دەهـاتین و نەماندەهێـشت بـەم ئاکامەبگـات، هـەرگیـز نەدەبـوا بیکوژی ئاخر ئەوەحەرامە، گوناحە.

وەسـتا (بـەدەم جگەرەداگیرسـان بەهەناسـەیەکی زۆر ساردەوە): هەر گوێشی مەدێ خوارزا، گرنگ ئەوەیەئێستا چی بکەین؟!

جەوهەر : چی بکەین؟ تۆ کەسێکت کوشتووە، من چی؟

وەسـتا : فـشەفش مەکـە، پارەکـە لـەلای خـۆت دابـنێ مەهێڵەکـەس ببـینێ. ئەگـەر یـەکێك پرسـی بڵـێ ئـەوەهی خاڵمەکارێکی گەورەی وەرگرتووەو ئەمەش پارەی کرێکارانە.

ئـەمشەوی جـەوهـەر خـەو نـەچـووە چـاوانی و هـەر بیری لەکارەکەدەکردەوە.

ئاخر کەی خاڵی ئەو برەپارەزۆرەی هەبووەتـا مـامـەڵـەی پێبکـات؟ ئاخـر کـەی خـاڵی لـەهـیـچ جۆرەمامەڵـەیـەك دەزانـێ جگەلـەدیوار دروستکردن؟؟

لـەناخی خۆیەوەهەسـتی دەکـرد خـاڵی درۆ دەکـات و ئـەم چیرۆکەهەڵبەسـتراوەو ڕووداوەکەبەشـێوەیەکی دیکەیـە، بـەڵام نەدەوێرا باسی بکات.

دوای دوو هەفتـەو لـەکاتی ئەنجامـدانی کارێـك جەوهـەر بەتیلەی چاوەکانی لەخاڵی ڕاما و بینـی زۆر سەیری خانووێك دەکات و لێی پرسی:

وەستا ئەوەماوەی چەند ڕۆژەهـەست دەکەم چاودێری ئەو ماڵەی بەرامبەر دەکەیت، خێرە؟

وەستا: دەنگت نزم کە، خوارزا....

جەوهەر: تێناگەم.... ئێمەتەنها ئەمڕۆ کارمان لەم ماڵەدا ماوە.

وەستا: تۆ جارێ دەنگت نزم بکە، تا کرێکارەکان گوێیان لەهیچ نەبێت، دوایی قسەدەکەین.

دوای تەواو بوونی کار و خەرجکردنی پارەی کرێکاران، وەستا خدر بەکرێکارانی گـووت ئێمەلەگەڵ جەوهەر دەچینەبازاڕ کێ لەگەڵ ئێمەدێت ؟ ئەوەبوو سێ کرێکار لەگەڵیان چوونەبازاڕ. دوای ڕاگـرتنی ئۆتۆمبێلەکەلـەیەکێك لەپارکەکانی بازاڕ، هەر پێنجیان چوونەنێو بازاڕ، بەڵام لەگەڵ ونبوونی سێ کرێکارەکەخدر یەکسەر دەستی لەتەکسیەك ڕاگرت. جەوهەر پرسی:

بۆ کوێ وەستا؟ خۆ دەتوانین بەئۆتۆمبێلی خۆمان بچین!

وەستا گووتی: قسەمەکەو سواریەخوارزا.

وەستا خدر داوا لەشوفێری تەکسیەکەدەکات کەبیانگەیێنێتەهەمان ئەو شوێنەی کەهەفتەیەکەکاری تێدا دەکەن، دوای هاتنەخوارەوەیان دونیا بەرەو تاریکبون دەڕۆیشت، دەچنە خانووەکەی بەرامبەر و وەستا خدر زۆر بەئاسانی دەرگاکە دەکاتەوەو دەچنە ژوورەوە، کاتێ وەستا خدر خەریکی کردنەوەی دەرگای ژوورەوەیە، ئافرەتێك دەرگاکەدەکاتەوە، یەکسەر وەستا خدر دەوی دەگرێت و دەیباتەژوورەوە و قۆڵبەستی دەکات، لەم کاتەدا جەوهەر لەترسان یارمەتی دەدات، کە دەچنە ژوورەوە دەبینن تەنها ئەم ئافرەتەو منداڵێکی تەمەن دوو ساڵان لەوێن، وەستا خدر دەست دەکات بەئەشکەنجەدانی و لێی دەپرسێ: پارەو زێڕتان لەکوێ داناوە؟

ئەویش لەوەلام دا دەڵێ: تەنها ئەم ئەنگوستیلەو گوارەیەم هەیەو هیچمان نییە، ئێمەخێزانی تازەین، تکایەئەم دوو پارچەیەببەن و بڕۆن، کەچی وەستا خدر دەست دەکات بەئەشکەنجەدانی و لەناو ماڵەکەدەگەڕێن. لەناکاو ژنەکەدەڵێ:

بۆ وا دەکەن وادەزانن ناتاناسمەوە؟ ئێوەئەو کرێکارانەن

کەماوەیەکەلەخانووی بەرامبەر کار دەکەن.

بەداخەوەوەستا خدر زۆر بەدڕندانەو بێ بەزەییانەبەچەقۆ دەکەوێتەلاشەی ئەم ئافرەتە بەستەزمانەو لەپێش منداڵەکەی دەیکوژێت و دواتر هەردوو پارچەزێڕ لەلاشەی جیادەکاتەوەو بەپەلەدەچنە دەرەوە.

جەوهەر بەدەم گریانەوەبەوەستا دەڵێت: بۆ وات کرد؟ بۆ ئەوەنەدڵرەق و بێ بەزەیی؟؟ زێڕەکەت بردبا و نەتکوشتبا ؟

وەستا خدر بە توڕەیی وەلامی دەداتەوە: نەتبیست چی گۆت؟ ئاشکرای دەکردین، واز بێنەتازەتۆش لەگەڵم تێوەگلاوی، دەبێ تۆش بەگەڵم بکەوی، تۆ هاوکارم بووی لەم کردارەدا.

جەوهەر (بەگریانەوە): کردار؟ بڵێ تاوان هەی زاڵم.

خدر: وازبێنەخوارزا، تازەبەدوای چوان مەچوو، وەرەبا تۆزێك پارەکۆبکەینەوەو دوایی تۆ بۆخۆت تۆبەبکە، من ئەسڵەن بڕوام بەهیچ نیەتا تۆبەی بۆ بکەم.

دوای هەفتەیەك لەڕووداوەکە و سارد بوونەوەی جەوهەر، وەستای تاوان، خدری دڵڕەق خوارزاکەی ڕازی دەکات کەلەگەڵی ئەم تاوانانەئەنجامبدات. ئەوەبوو دەستیان بەزنجیرەتاوانێك کرد و پێنج ماڵیان بڕی و لە یەکێکیان زۆر بەخوێن ساردی خاوەن

ماڵیان خەڵەتانی خوێن کرد. جەوهەر وەکو خاڵی لێهاتووبوو، مرۆڤێکی دڵڕەقی بێسیما و بێ بەزەیی، تەنانەت کرێکارەکانیش هەستیان بەم گۆڕانکاریەکردبوو.

لەئاکامی ئەم تاوانانە بڕێك پارەیان دەستکەوت کەلەهەوا و نەفسی خۆیان خەرج دەکرد و توانیان دەمانچەیەك بکڕن بۆئەوەی بەئاسانترین شێوەتاوانەکانیان پێ ئەنجام بدەن.

بەیانیەك شەڕە ئۆتۆمبێلەکەی وەستا تێك دەچێت و دەڵێت:

خوارزا بۆ نایەی سەیارەیەك بدزین و ماوەیەك بۆ خۆمان بەکاری بێنین ؟

جەوهەر دەپرسێ: ئۆتۆمبێل ؟ ئەی چی لەشوفێرەکەبکەین ؟

وەستاش دەمانچەدەردێنێ و دەڵێ:

ڕەوانەی ئەودیوی دەکەین و دەست دەکاتەقاقای پێکەنین.

بەیانی باڵی بەسەر شار دەکێشێت و خەڵك بۆ ڕزق و ڕۆزی دەچنە دەرەوە بەهیوای پەیداکردنی بژێوی ژیانیان بۆ منداڵەکانیان، کەچی لەیەکێك لەدەرگاکانی دۆزەخ دوو

تاوانبار وەکو مۆتەکەدێنەدەر بۆ تێکدانی ڕەوشی ژیان، بەو نیازەی کە ئەمڕۆ یەکێك خەڵەتانی خوێن بکەن، کەچی نازانن ئەمڕۆ ڕۆژی دەرکەوتنی ڕاستیەکانە.

وەستا و خوارزا کاتێ دەگەنە سەر شەقامی سەرەکی دەست لەتەکسیەك ڕادەگرن و پێی دەڵێن بمانگەیەنەفلانەشارۆچکە، کەنزیکەی سەد کیلۆمەترێکەوەلەشار دوورە، وەستا لەگەڵ شۆفێر سوار دەبێت لەپێشەوەو جەوهەریش لەدواوەدادەنیشێت، بەر لە گەیشتنیان بۆ شوێنی مەبەست خدر دەمانچەکەدەردەهێنێت و ئاراستەی شوفێرەکەی دەکات و دەڵێ:

ئۆتۆمبێلەکە بکوژێنەوەو وەرە خوارەوە.

شوفێرەکەش زۆر بەپەشۆکاوی دەڵێ: چ دەکەن بکەن، ئۆتۆمبێلەکەببەن، پارەش ببەن بەس مەمکوژن.

شوفێرەهوشیارەکەئۆتۆمبێلەکەلەشوێنێکی ئەوتۆ ڕادەگرێت کەمەودای ڕاکردنی هەبێت، ئەوەبوو دوای هاتنەخوارێ دەستدەکات بەڕاکردن و خدریش چەند گوللەیەکی ئاڕاستە دەکات، هەر چەندە شوفێرەکە بریندار دەبێت بەلاّم ئازایانەلەڕاکردن ناوەستێت تا خۆی لەشوێنێك بزر دەکات.

خدر داوا لەجەوهەر دەکات کەبێت و ئۆتۆمبێلەکەلێ بخورێت بۆ گەڕانەوەبۆ شار، بەو مەزەندەی کەشوفێرەکەفیشەکی بەرکەوتووەو لەیەکێك لەو شیوانە بەمردوویی کەوتووە.

ئەم چەند فیشەکانە دەبنە سەرەداوی ئەو زنجیرە ڕاستیانەی کە کۆ دەبنەوەو لەئاکامدا دەبنە گوریسێکی ئەستوور بۆ لەسێدارەدانی تاوانباران، هێزەکانی پێشمەرگەی ناوچەکەلەگەڵ بیستنی دەنگی گوللە یەکسەر دەکەونەخۆ و مەفرەزەیەك بۆ بەدواداچوونی ئەم دەنگەدەردەکەن و لەمیانەی گەڕانیان شوفێرەبریندارەکەدەدۆزنەوەو دوای زانینی ڕاستیەکان بەئامێری بێتەل هەواڵ بۆ سەرجەم بازگەکان دەنێرن و ژمارەو ئاکاری ئۆتۆمبێل و تاوانباران لەمیانەی گشتاندنێك بڵاودەکەنەوە...

دوای ماوەیەکی کورت هەر دوو تاوانبار لەبازگەیەك دەستگیردەکرێن و دواتر ڕادەستی پۆلیس دەکرێن...

سەرەتا وەستا خدر هیچ قسەناکات و دان بەهیچ نانێت، کەچی جەوهەر لەژێر باری هەست کردن بەپەشیمانی، دان بەهەموو تاوانەکان دەنێت، دواتر سەرجەم ئەم ڕاستیانەڕوو بەڕووی وەستا دەکرێنەوە و ئەویش دەڕووخێ و

سەرجەم ڕاستیەکان دەدرکێنێ..

دوای ڕەوانەکردنی دۆسیەکە بۆ دادگا، و بەهۆی کوشتنی سێ کەسی و هەوڵی کوشتنی یەکێکی تر هەردوو تاوانباران سزای لەسێدارەدانیان بۆ دەردەچێت.

بەرە بەیانی لەسێدارەدان، هەردوو تاوانبار دەهێنرێنەبەر دەم پەتی سێدارە، سەرەتا وەستا خدر دەهێنن و بڕیارەکە دەخوێننەوە مامۆستایەکی ئاینی پێی ڕادەگەیەنێ کە ئەمە سزای تاوانەکانی خۆیەتی و داوای لێدەکات تۆبە بکات و پەشیمان بێتەوە، کەچی لەهیچ شتێك پەشیمان نابێتەوەو تەنانەت لەکاتی لەسێدارەدان ناتوانێ وشەی شایەتمانیش بێنێت.

کاتێ ڕۆڵی جەوهەر دێت، و دوای قسەکانی مامۆستای ئاینی، زۆر بەکوڵ دەگری و پەشیمانی خۆی دەردەبڕی و داوا دەکات مەودای بدەن دوو رکات نوێژ بکات، ئەوانیش رێی پێدەدەن و لەمیانەی نزاکانی پاش نوێژ دەگری و بەهاوارەوەدەڵێت:

خوایەگیان من هەڵەم کرد و شایستەی ئەم سزایەم، داواکارم تۆبەم قبوڵ بکەی و لێم خۆشبیت، خوایەگیان لەگوناهەکانم

خۆشبە.

لەگەڵ دەرکەوتنی خۆر، و دەرچوونی خەڵك بۆ سەر کار، شاریش لەدوو تاوانباری بێبەزەیی ڕزگاری دەبێت و لەگەڵ گیان لەدەست دانیان ئارامی بۆ شار دەگەڕێتەوە.

دوو تاوانبار کە بەهای مرۆڤایەتی لایان ئەوەندە کەمبوو، لە پێناو چەند گرامێك زێڕ دایکێکیان لەبەردەم رۆڵە دوو ساڵەکەی خەڵەتانی خوێن کرد.

لەگەڵ هاوسەر  و سێ منداڵەکەم ژیانێکی خۆش و ئاسوودەمان بە سە ر دە برد، لە هیچمان کەم نە بوو، هەر چەندە هەردووکمان ئاستی خوێندەواریمان بەرز نەبوو. من ژنی ماڵ و هاوسەرەکەم فیتەر بوو.

بەڵام زۆر رازی بووین و بە یەکەوە رووبەرووی ناخۆشیەکانی ژیان دەبووینەوە.

متمانەمان بەیەك هەبوو، لێك گەیشتن و تێگەیشتنێکی چاك لەنێوانماندا هەبوو.

بەیانیان منداڵەکانم بەرەو قوتابخانە بە رێدەکرد و دواتریش هاوسەرەکەم بۆ کار دەچوو، منیش خەریکی ئیش وکاری ناو ماڵ دەبووم تا جگەر گۆشەکانم دەهاتنەوە، دواتریش هاوسەرە خۆشەویستەکەم.

وامزانی ژیان هەر بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت، نەمزانی دەورانی گەردوون زۆر سەختە و رۆژێك دێت ئەم هەموو کامەرانیە لەبیابانی ژیاندا دەبێتە بەردە تەڕاوێلکە و لەغەیری ناخۆشی هیچم بۆ نامینێتەوە......

هەموو رەنجمان لە دوونیا لە چەند پارچە خشلێك دابوو، کە بۆ رۆژانی رەشمان هەڵگرتبوون.

تەنانەت نەمدەتوانی هەموودەم لە بەریان بکەم. ئێمە کە خانەوادەیەکی سادە و ساکار بووین و خانووەکەمان خانویەکی ئاسایی بوو، شوێنێکی ئەوتۆمان نەبوو بۆ شاردنەوەیان بۆیە بریارمان دابوو زۆر بە شێوەیەکی ئاسایی پارێزگاری لەم خشڵانە بکەین، بەم مەبەستە لە کیسەی عەلاگەیەکی رەشی ئاساییمان کردبوو و لەدواوەی خانووەکە لەسەر گیزەرەکەمان دادەناو، ئەوەی دەیبینی وایدەزانی پەلکە نانی وشك بۆوەیە.

وامان دەزانی قەد کەسێك بیری لەوە ناکاتەوە کە بیبات.

بیرمە رۆژێکی ئاسایی هاوسەرەکەم منی لە ماڵی دایکم دانا و خۆشی چوو بۆ کاری خۆی لە ناوچەی پیشە سازی، ئێوارە وەکو هەموو جارێك بە ئۆتۆمبیل هاتەوە دوامان، بەخۆشی گەڕاینەوە ماڵەوە.

وەکو هەموو جارێك هاوسەرم سەیارەی راگرت و منیش هاتمە خوارەوە، یەکسەر بەرەو حەوشەی دواوە چووم بۆ هینانە ژوورەوەی کیسە عەلاگەکە، بەلام کیسە رەشەکە نەمابوو.

شێرزە بووم و یەکسەر هاوارم کرد و هاوسەرەکەم هات و گوتی:

چی بووه؟

گوتم : پیاوەکە زێڕەکەمان دیار نییە !!!

پیاوەکەم توورە بوو و بارودۆخی لەمن زیاتر تێك چوو و گوتی:

چۆن شتی وا دەبێت من خۆم دەرگام کلیل داوە و بە یەکەوە دەرچووین؟

گوتم: نازانم. ئەی هاوار زێڕەکەمان دزرا، دە ستم کرد بە لەخۆدان.

دەر و دراوسێ بە دەنگی هاوارمان هاتن و تەلەفۆن بۆ پۆلیس کرا و دەستیان کرد بە لێکۆلینەوە.

سەیر لەوە دابوو هیچ دەرگایەك نەشکابوو و هیچ ئاسەواری کەسێکی نامۆ نەبوو لە خانووەکە.

هەر تەنها و تەنها زێڕەکە نەمابوو، دەنا هەموو شتێك ئاسایی بوو.

شەو دوای رۆیشتنی پۆلیس و چوونەوە ماڵەوەی دراوسێکان، مێردم زۆر بە توورەیی رووی پرسیاری لەمن کرد و گوتی:

چیت لەو زیرانە کردووە ! ! ! ؟؟؟

منیش شێت بووم و بە دەم گریانەوە گوتم: چی ... چی؟؟ ئەو پرسیارە یەعنی چی؟؟

هاوارم کرد: چۆن پرسیاری وا لەمن دەکەی؟ دە ساڵە هاوسەرین و زۆرمان متمانە بە یەکە چۆن دڵت هات وا بیر بکەیەوە؟

بە دەنگێکی بەرزتر دووبارەی کردەوە:

چیت لەم زێرانە کردەوە ئافرەت؟

منیش زۆر توورە بووم گوتم : گەر متمانەی ئەم برە زێرەت پێم نیە واتا هیچ متمانەت بەمن نیە، بە داخەوە دوای سێ منداڵ ئەم قسانەم لەگەڵ دەکەی، شەرم لەخۆت بکە، من قبول ناکەم ئەم توومەتانەم بدەیە پاڵ، بۆ تۆ نەدبردبێت؟

بەلام وا دیاربوو شەیتان چووبوە مێشکی و ژیری لە دەستدابوو، بۆیە بەم شەوە من و سێ منداڵەکەی دەرکردە دەرەروە و بە هاوار گوتی:

گوێبگرە ئافرەت یان ئەو زێرانە دەهێنیتەوە یانیش تەلاقت دەدەم ...

زۆر خەمباربووم و بە چاوی پڕ گریان و دڵێکی شکاوەوە، بەم شەوە دەستی منداڵەکانم گرت و چوومەوە ماڵی باوکم.

وای لێهات کێشەکە ئەوەندە وابەستەبوو بە ژیانی کۆمەڵایەنی منەوە، ئەوەندە باس لە بوونی دز و شکاندنی ماڵەکە نەدەکرا.

خزم و کەس و پیاو ماقوڵان هەموویان چوونە لای ئەو مێردە نارۆشنبیر و بێ متمانەم بۆ روونکردنەوەی بابەتەکە، ئەوەندە لەگەڵ ئەو هەوڵیان دەدا، ئەوەندە خەریکی بنکەی پۆلیس و سکاڵا کردن نەبوون لە دزێك کە ماڵمانی وێرانکرد.

ئاخر زۆر سەیرە ئەو کەسەی کە دەیگۆت خۆشم دەوێی و منیش دڵی خۆمم پێسپاردبوو، ئێستا لەبەر چەند مسقاڵ زێرێك هیچ متمانەی بەمن نەماوە. گەرچی من هەموو ژیانم بۆ ئەو و منداڵەکانی تەرخان کردبوو، بەڵام وا دیارە کە لە درۆیەکی گەورە دەژیام، ئەو پیاوە ئەوەندە خەمی سامان و خشڵەکەیەتی ئەوەندە خەمی من و هەستی منی نەبوو.

لەم ماوەیەدا بە تەواوی شیرازەی ژیانم تێکچوو، جگە لەم کێشەیە خزم و ناسیاوانیش لە لایەن خۆیانەوە سێدارەیان دامەزراند و دەستیان بە قسە و قسە لۆك کرد، بە درۆ و بوختان

و مەزەندەی خراپ، ناو و ناوبانگیان لە سێدارە دام و زۆر بێ ویژدانانە دەستیان کردە ناو زڕاندنم. منیش زۆر گریام و حەواڵەی خوام کردن، لەوە زیاتر هیچم پێ نەکرا.

بەردەوام نزام دەکرد: خوایە گیان خۆت ئاگاداری کەمن لە هەموو ئەو تۆمەتانە بێ بەریم، من بەردەوام خۆم و ماڵ و منداڵم پاراستووە، هەرگیز و هەرگیز هەڵەم نەکردووە, پەروەردگارە بە هانام وەرە. نامەوێت ماڵم لێ تێکبچێت، هەر تۆم هەیە لەم دونیایەدا، خۆت چاك دەزانی من بێ تاوانم.

خوایە گیان لەبەر هاوسەریشم نەبێت لەبەر ناوی خۆم و بنەماڵەکەم کەمن زۆر پارێزگاری خۆم کردووە و یەك بست لە ڕێی ڕاست لام نەداوە، خوای بێکەسان فریام کەوە ...

شەو و ڕۆژ لە نزا و پاڕانەوە نە دەوەستام و نەمدەویست کەس بدوێنم، ئاخر زۆر ناخۆشە بەبێ هیچ بەڵگە و بنەما بوختانت بۆ هەڵبسترێت.

ئەوەی لەم ئەزموونە تاڵە زۆر ئەزیەتی دەدام بێ متمانەیی هاوسەرەکەم بوو، ئاخر چۆن دەبێت وا زوو مرۆڤ بڕوخێت؟ هەموو سامانی دونیا ناتوانیت تازە ئەو متمانەیە لەنێوانمان دروست بکاتەوە!

ئەو بە بێ هیچ بنەما متمانەی بەمن نەما. لە هەمان کاتدا وێنەی ئەو پیاوەی کەخۆشی دەوێم و ئامادەیە بە گیانی خۆی پارێزگاریم لێ بکات لە مێشکم رەشبوویەوە.

چۆن دەبێت پیاو ئەوەندە رەزیل و پولەکی بێت؟ پیاو؟ چی...؟ هەموو کەسێك پیاوە؟ نەخێر....

هەرگیزا و هەرگیز هەموو نێرینەك پیاو نیە. بە ڕای خۆم متمانەی نێوان هاوسەران دەبێت وەکو شورەیەکی پۆلاین وابێت کە پەیوەندی نێوان ئەم دوو مرۆڤە لە هەر ئەگەرێك یان مەترسیەکی دەرەوەی خێزان بپارێزیت، هەروەك چۆن شەرەف هەر ناو گەلی مرۆڤ نییە، بەڵکو کۆمەلێك رەوشت و بنەما و هەڵسوکەوت و باوەڕە.

ئاواش متمانەیی پەیوەست نییە بە هەڵسوکەوتێك یاخود رووداوێك، بەڵکو کۆمەڵە بنەما و راستییەك دروستیان دەکات.

بە هەر حاڵ بڕیارمدا زۆر بە خۆ ڕاگری و بە بڕوابەخۆبوون ئەم ئەزموونە تاڵە بە سەر بەرم. منێك کە بەر لەم رووداوە کەسێکی بێ هێز و متمانە بووم و لە هەموو شتێك پشتم بە هاوسەرەکەم دەبەست، ئێستا بۆم روون بووەوە کە خۆم لە بنە ڕەتدا زۆر بە هێزم، زۆر بە هێزتر لەو کەسەی کە بۆ چەند مسقاڵ

زێرێك متمانەی بە نزیكترین كەسی نەما.

بۆیە بڕیارمدا لەمەودوا پشت بە خۆم ببەستم و متمانەم بەخۆمەوە هەبێت.

ڕۆژ هات و چوو، تا موژدەی خۆشم لە پۆلیسەوە بۆ هات، پۆلیس هەواڵی دەستگیركردنی دزەكەی ڕاگەیاند.

كاتێ هەواڵەكەم بیست بە دەست خۆم نەبوو، وەكو قوتابییەك كە هەواڵی سەركەوتنی بە نمرەیەكی زۆر باش پێدرابێت، چۆن بەرەو دەرگای قوتابخانە ڕادەكات ئاوا... وەكو تەیرێكی كامەران لە شەقەی باڵمداو بەرەو دەرگای ئەو ماڵە فڕیم كە هاوسەرە بێ متمانەكەم بە شەوی تاریك من و منداڵەكانمی فڕێدایە دەرەوە.

كاتێ گەیشتم قەرەباڵغیەكی زۆر لەبەر دەرگای ماڵەوە بوو، هێزێكی گەورەی پۆلیس دزەكەیان هێنابوو و دان پیانانی دزەكەیان تۆمار دەكرد، لە نێو ئەو حەشامەتە، كەیفخۆشی دراوسێكان بە گەڕانەوەم و جدیەتی پۆلیس بۆ ڕێكخستنی دۆخەكە و سەرشۆڕی هاوسەرە بێ متمانەكەم سەرەنجی ڕاكێشام، كە زۆر بە كەساسی و بێ مەیلی وەستابوو و زاتی نەدەكرد تەنانەت سەیریشم بكات. لە نزیكەوە گوێم لە دزەكە بوو

که دەیگۆت:

ڕۆژی ڕووداوەکە لەو هەیکەلەی تەنیشتیان بەسەر کەوتم و بە بۆڕیەکانی ئاو خۆم شۆڕ کردەوە تا بچمە نێو ئەو ماڵە.

بەر لەوەی بگەمە سەر گیزەرەکە پێم بە کیسە عەلاگەیەك کەوت کە قورس و ڕەق دیاربوو.

کە هاتمە ئەرز یەکسەر کردمەوە بینیم بڕێك خشڵی تیایە، بۆیە بردم و بە هەمان بۆڕی ئاو سەرکەوتم و بە هەمووی دە دەقە لەو ماڵە نەمام، جگە لەو دزیە شەش دزی ترم ئەنجامداوە ...

لە دڵی خۆم گوتم ئافەرین دزی مەعلان بە دە دەقە دڕ دۆنگیو وەهمی دە ساڵ لەگەڵ ئەم کابرایە بێ متمانە یەمت بۆ ساغ کردەوە.

کاتێ گەیشتمە بەردەم قاپی ماڵ، هەموو دراوسێ و خزم و کەسانی خۆم و هاوسەرم ڕاوەستابوون لە چاوەڕوانی من...

بە هاوسەرەکەم گوت: سەرت بەرزکەوە ... ئەمڕۆ خوای گەورە بڕوانامەی بێ بەری منی دەرکرد لەو بوختانەی خستبووتە پاڵم... هیچ سوپاسی تۆ ناکەم... تۆ کەسێکی بێ متمانەی، سەرت بەرزکەوە و چاوت بخە نێو چاوانم... نەخێر یەك قسە مەکە... ناتوانی سەرت بەرز بکەی؟

ده سەرت زیاتر بەرز بکە بۆ ئاسمان و خوا ببینە ئەکیدم ئەوەشت پێناکرێ.

سەرم بەرز کرد و گوتم: زۆر سوپاس خوای گەورە کە لەم ئەزموونە بە سەرکەوتوویی دەربازت کردم و منت بەهێزتر کرد و وات لێکردم زیاتر متمانەم بەخۆمەوە بێت و کەسایەتی خۆم بدۆزمەوە.

زۆر سوپاس پەروەردگارم کە لە بەرامبەر چەند مسقاڵ زێرێك بە قەد چیای سەفین قورسی و متمانەت بەمن بەخشی.

گەنجێکی لەخۆبایی، لووت بەرز، لەبەر ئەوەی تاقانەبوو، بۆیەهیچ هەستێکی بەلێپرسراوێتی نەبوو. وا فێرکرابووکەچی بوێت بەچاو نوقانێك بۆی بێتە کایەوە. کاری بازرگانی کردبووە پەردەیەك بۆ گەشت کردن بۆ ولاتان بەمەبەستی ڕابواردن و شەوانی سوور لەگەڵ سووزانییەکان. تاکەبازرگانی کەلێی سەرکەوتوو بوو، بازرگانیکردن بەگوناح بوو. کالآ لای ئەو بریتی بوو لەگۆشتی سوور و سپی و ڕەشی ئافرەتانی بەدڕەوشتی ولآتان. بەناوی هاوردەکردن دەچووە(چین ، سوریا، تورکیا، دوبەی)، بەلآم هەر تەنیا شوێن هەوەسی خۆی کەوتبوو. هیچ درێغی نەدەکرد و لەهیچ شتێك نەدەسڵەمیەوەو یەك زەڕەترسی خوای لەدڵ نەبوو.

لەژێر فشاری دایك و باوکی ڕازی بوو ژیانی هاوسەری پێك بهێنێ، تاکەمەرجی ئەوەبوو کەلەگەڵیان بمێنێتەوەبۆ خزمەتکردنیان. کەچی خۆی بیری لەوەدەکردەوەکەخێزانەکەی لەگەڵیان جێبهێڵێت و خۆی دەست بە گەشتکردنەوە بکات و بەکەیفی خۆی لە ولآتان لەباوشی ئافرەتانی بەدڕەوشت بخەوێت.

دوای گەڕان کچێکی ناسیاویان بۆ دۆزییەوە، کەجوان و بچووك بێت بەڵکو چاوی پڕدەکات و چیتر بەدوای هەوەسی

خۆیــــەوەنابێت. ئـــــەوەبوو دوای گواســـــتنەوەبەدووهەفتە، خوڕەوشتەکۆنەکەبانگی کرد بۆ سەرکێشیەکی دیکەی حەڕام، بەبیانووی ئەوەی لەبەر نەبوونی بەرهەمی هاوردە کار وەستاوە بۆیە دەبێ گەشت بکات بۆ وڵاتان بۆ هێنانی کاڵا. ئەوەبوو دووبارەدەســتی بەگەشــتکردن کــرد و دووبارەگەڕایــەوەدونیای ڕەشی ڕابواردن.

ڕۆژێکیـــان یـــەك لەبرادەرەدڵــسۆزەکان هـــەواڵی ئـــەم خراپەکاریانەی بەباوکی ڕاگەیاند. سـەرەتا بـاوکی زۆر توڕەبـوو، بڕیاری دا سەرزەنشتی بکات، بەڵام بەهۆی خۆشەویستی زۆرەوە بۆی، هەر زوو بەزوو ئەم بیرۆکەی ڕەت کردەوە، بەڵام زۆر بێ تاقەت بوو، ئاخۆ خۆی و خێزانی دوو کەسی دیندار و خواناسن بۆ دەبێ کوڕەکەیان وا دەربچێت؟! ئایا هۆکاری ئەم لادانەی کوڕەتاقانەکەیان چیە؟؟!!

شەو خەو بە چاوانی نەهات کەوتە دوان لەگەڵ خۆیدا:

تـۆ بڵێی سامانەکەم حەرام بووبێت؟ دەکرێ من شتێکی خراپم کردبێ و ئێستا لەکوڕەکەم دەرچێ؟

ئاخر من بەتەواوی ژیانم خراپەی کەسم نەبووە، لەدەرگای کەسم نەداوە، هەموو ژیانم لەچاکەکاری و کارکردن

خەرجکردووە، دەبێ هەڵەی من چی بێت ؟

لەم کاتەدا وەکو ئەوەی بڵێ شتێکی بەبیردا هاتبێتەوە هەڵدەستێتەوەو دادەنیشێت:

زۆر ڕاستە، خەتای منە، من هیچ ڕۆژێك لەگەڵی دانەنیشتووم، هیچ ڕۆژێك ئامۆژگاریم نەکردووە، ئەسڵەن مەودام نەبوو دوو قسەی لەگەڵ بکەم بەباش یان بەخراپ.

منێك کەهەموو کاتم بۆ کار و کاسبی تەرخانکردبوو و پارەم کۆدەکردەوە، لەبیرم کرد تۆزێك فێری ڕەوشت و ئایین و چاکەی بکەم. من پارەم لەسەر یەك دادەنا و ئەویش گوناحی لەسەر یەك دادەنا، ئێستا من خاوەنی پارەم، کەچی ئەو خاوەنی خووڕەوشت و ئاکاری خراپە، ئەکیدم خراپەکارییەکەی سەری سامانەکە م دەخوات.

ئەی هاوار پارەکەم سەری خواردم. هەرچیم کۆ کردۆتەوەبەم سالانەدا ئەوا لەسەر هەوەسی خۆی خەرجی دەکات و ڕۆژی دوایی خوای گەورەپرسیارم لێدەکات لەسەر ئەم پارەیە کەبۆ کوڕم بەجێهێشتووەو ئەو لەشتی خراپ خەرج دەکات.

کاتێ ئەم بیرۆکەبەمێشکی داهات لەداخان قوڕگی وشك بوو و زۆر حەزی کرد بچێ بەقومەئاوێك دەوی وشکی تەڕ بکات بەڵکو

ئاوێك بەو ئاگرەدادەكات كەلەناخی بەرز بۆتەوەو هەموو گیانی لەداخان دەسوتێنێت.

سەری بەرزكردەوە بینی سێی دوای نیوەشەوە، كاتێ چووە ناندین، گوێی لەدەنگەدەنگێك بوو لەژووری كوڕەكەی لەسەرەوەدێت، دەبێ كوڕەكەی هاتبێتەوەو بەوانی نەگوتبێت ؟

كاتێ لەپەیژەكان بەسەر دەكەوت دەنگە كە روونتر دەبوو و زیاتر دەچووەگوێی كەئەمەدەنگی بووكەكەیتی بەلاّم ئەوی دی دەنگی كوڕەكەی نییە، مێشكی كاس بووبوو . ئاخۆ دەبێ كێ بێت، چ بێت؟

ئەم پرسیارانەوەكو مۆتەكەیەك لەسەر سینگی پەنگی دەخواردەوە.

كاتێكدەرگای كردەوەبینی بووكی لەگەڵ گەنجێك بەنیمچەڕووتی دانیشتوون پێدەكەنن.

خوێن چووەسەری و یەكسەر ئەم گەنجەداوێن پیسەی دەستگیر كرد، هەر بەم شەوەبە مۆبایل پەیوەندی بە خزم و كەسانی خۆی و بووكەكەیان كرد، تا سەرجەم لایەنەكان كۆبوونەوە، كات بوبووە كاتژمێر چواری بەرەبەیان. هەریەك لەئامادەبووان قسەیەكی دەكرد، یەك دەی گووت با بیان كوژین،

یەك دەیگووت بو ڕادەستی پۆلیسیان نەکەین؟ یەك دەیگووت با کێشەکەبە هێمنی چارەسەر بکەین و ئابڕووی خۆمان نەبەین. بەڵام یەکێك گووتی:

بەڕای من با پرس بەخاوەن بابەتەکەبکەین، با مێردی ئەم ژنە کە ئێستا خۆی لێرەنییە بڕیار بدات، و ئەو چ بڵێت ئێمەهەموو پابەند دەبین. هەموو لایەنەکان لەسەر ئەم پێشنیازە رازی بوون.

کابرا بەم شەوەمۆبایلی بۆ کوڕەکەکرد و دوای چەندین زەنگ کەس وەڵامی نەدایەوە. دووبارەو سێبارەی کردەوە، لەناکاو یەکێك لەم دیوو هێڵ مۆبایلەکەی هەڵگرت کەدەنگی ئافرەتێك بوو، بەزمانێکی بیانی گووتی:

تۆ کێی؟ چیت لێمان دەوێ بەم شەوە؟ بۆ هەراسانمان دەکەی؟

باوکەکەبەتوڕەیی بەهەمان زمان وتی:

مۆبایلەکە بدەکوڕە بێ ئابڕووەکەم.

ئافرەتەکەش مۆبایلەکەی دا بەدەست کوڕەکەی:

خێرە باوکەبەم شەوە؟ چیتان دەوێ؟ یانی بەم شەوەش

ناتوانین ئیسراحەتی خۆمان وەرگرین؟ چی بووە؟ قاتی دونیا کاول بووە؟ دە لەپیاو گەڕێن ئیسراحەتی خۆی وەرگری؟

باوکەکەش وتی: نەخێر دنیا کاول نەبووە، بەڵکو شەرەفت شکاوە! ئیسراحەتی خۆت وەرگرەناپیاو، خەڵکیش لێرەئیسراحەتی لەماڵت وەرگرتووە، زۆر باشیان گوتووە:

چ دەکەی ئەوەدەدووریتەوە...، و مۆبایلەکەی داخست.

سەرەتای هەشتاکان، سنووری نێوان (ئێراق) و (ئێران) شانۆی جەنگێکی کاولکاری بێهوودەبوو، مردن باڵی ڕەشی شوومی بەسەر ئەم دوو وڵاتەکێشابوو، گەنجانی هەردوو وڵات پۆل پۆل بەرەو کورەی جەنگ دەبردران و ئەوەی بەئاگری جەنگ نەکوژرابا ئەوا بەبیانوی ڕاکردنی سەربازی، یاخود لەژێر ناونیشانی بێمانای وەکو ترسنۆك و خۆفرۆش تیرباران دەکرا.

ناوم بۆ خزمەتی سەربازی هات و بەمەبەستی تەواوکردنی هەندێ دیکۆمێنتی تایبەت بەڕەگەزنامەی عێراقی و دەفتەری خزمەتی سەربازی لەگەڵ هاوڕێیەکم روومان لەشاری بەغدا کرد، بەمەبەستی ئەنجامدانی کارەکان بەزووترین کات بەرەبەیان لە هەولێر دەرچووین.

ئەوەبوو لەیەکێ لە دەروازەکانی شاری بەغدا بەسەر ڕووداوێکی هاتوچۆ گەیشتین کەکامیۆنێکی بار هەڵگر خۆی بەئۆتۆمبێلێك دا کێشابوو، ئۆتۆمبێلەکەوەرگەڕابوو، بەو بەیانییەکەس لەوێ نەبوو، ئێمەش بەئۆتۆمبێلەکەبەخێرایی تێپەڕین، داوام لە شوفێرەکەکرد بگەڕێتەوە و ڕاوەستێ نەوەك خەڵکێك پێویستی بەیارمەتی هەبێت. ئەوە بوو برادەرەکەم وتی:

کاکەپەیوەندیت نەبێت، کەی ئەوەکێشەی ئێمەیە.

منیش وتم : بۆ خاتری خوا بگەڕێوە.

بــە بیــستنی ئــەم رســتەیە یەکــسەر گەڕایــەوە. کــە هاتــینەخوارەوەو بــەرەو ئۆتۆمبێلەکــەڕامان کــرد، بیــنیمان کەشــوفێرەکەمردووەو لەدواوەکــچێکی گــەنج بریــندارەو گــیری خــواردووەو نـاتوانــێ بێــتەدەر. یەکــسەر هێـنامــانەدەرێ و گەیاندمانەنەخۆشـخانە. کـاتێ پەرسـتاران خـەریکی چارەسـەری بـوون، پـۆلیس ئێمـەی دەسـتگیر کـرد. برادەرەکـەم توڕەبـوو و گووتی:

بزانەچـیت بەسەر هێناین.

منیش گوتم: تۆزێك سەبرت هەبێت.

بە پۆلیـسەکانم گـووت: کاکەئێوەهەڵـەن. ئێمەئـەم کـچەمان ڕزگار کردووە. لەو ئـان و ساتەدا کۆمەڵێـك ئەفسەری پــلەبەرزی ســەربازی بــەژووریێ کەوتــن و زۆر بـەپـەشــۆکاوی لەهــەواڵی کــچەزامدارەکـەیان دەپــرسی. ئێــمەزۆر ترسایــن. پۆلیـسەکان لەتـاوی ئەم دیمەنەئێمەیان خستەبەندیخانەی نەخۆشخانەکە.

هــاوڕێــکەم بـەردەوام دەیگــووت:

هــا.....؟! پـێـت خۆشـە....؟! دە هـەڵی گـرەوە.

منیش دەمگووت:

پەشیمان نیم، لەبەر خاتری خوا کردمان و قەد خوای گەورەنێمەلەم تەنگژەیەجێ ناهێڵێت، تۆزێك ئارام بە برام.

دوای کەمێك، پۆلیس دەستی کرد بەئەنجامدانی لێکۆڵینەوەلەگەڵمان. مولازمێکی پۆلیس پرسیاری ڕووداوەکەی لێ کردین. لە وەڵامدا سەرجەم ڕووداوەکەمان گێڕایەوە. لەم قسانەدابووین لەناکاو هەندێ پاسەوان و ئەفسەرێکی پلەبەرز هاتنەژوورەوە.

مولازمەکەبەپەلەهەڵساوەو سڵاوێکی سەربازی کرد و گوتی:

بەڵێ گەورەم.

ئەفسەرەپلەبەرزەکەدانیشت و گووتی:

بۆم باسکەن ئەم کارەساتەچۆن بووە؟

منیش بۆیم گێڕایەوە و گووتم: تەنها لەڕاهی خوا ئەم کارەمان کردووەچاوەڕێی هیچ سوپاس و پاداشت نین.

ئەویش لەوەڵامدا گووتی (بارك اللەبیکم) خوا بتان پارێزێت. لە هۆکاری هاتنمانی بۆ بەغدا پرسی. منیش باسەکەم

بۆیکرد. ئەویش سەرجەم بەرایی و کاغەزەکانی لێ وەرگرتین و هەموو کارەکانی بەیەك کاتژێر بۆ تەواوکردین.

ڕۆژگار هات و چوو. لەخزمەتی سەربازی بەردەوام بووم. دوای دوو ساڵ لەیەکێك لە بەرەکانی جەنگ بووم، یەکە سەربازیەکەمان ڕەفیقێکی بەعسی هەبوو کە بەردەوام لەبەر چاوی ئێمەجوێنی بەکورد و شۆڕشی کورد دەدا.

ڕۆژێکیان بوو بەگەنگەشەم لەگەڵ سەربازەعەرەبەکان. ئەم ڕەفیق بەعسیەدەستیکرد بەجوێندان بەگەلی کورد و سەرکردەکانی. زۆرم پێناخۆش بوو. سەرەتا قسەم نەکرد کەچی ئەو هەر بەردەوام بوو و دەستی بە قسەی خراپ کرد. بۆیە خۆم پێنەگیرا یەکسەر جوێنم بەخۆی و سەرکردەکانی داوە. ئیتر بووە شەڕمان. منیش کۆڵی هەموو ئەو ساڵانەی سەربازی و ئەم هەموو قسانەم بەو دەرهێنا و باشم تێی هەڵدا. کە چی هەموو سەربازەعەرەبەکان بەکۆمەڵ لە منیان دا و دواتر لە بەندیخانەی یەکەسەربازیەکەدەستبەسەریان کردم و دواتر ڕەوانەی ئیستخباراتی سەربازیان کردم. لەوێ ماوەی دوو

مانگ بی سەر و شوێن کرام و ڕۆژم بە چاوی خۆم نەدی و ئەشکەنجەو ئازارێکی زۆریان دام، تەنانەت کەس نەیدەزانی لەکوێم و ئایا ماوم یان لەسێدارەدراوم. دواتر منیان سپاردەدادگای شۆڕش (محكمة الثورة) لەبەغدا. گومان لەوەدا نەبوو، ئەم سپاردنەبەواتای لەسێدارەدان دەهات بۆ هەر عێراقیەك کەبدرابووایەئەم دادگایە.

بەهەر حاڵ ڕۆژی دادگایی هات و من و (١٤) چواردە کەسی دیکە لەسەر تاوانی جیاواز بردراینە بەردەم دادگا. گومان لەوەدا نەبوو بردنی هەرکەسێك بۆ بەردەم ئەم دادگایە بە واتای ئەوە دەهات کە ئەم کەسەخۆفرۆش و ناپاك و وڵات فرۆش و بەکرێگیراوە، و پێویستە بکوژرێت.

بەهەر حاڵ چاوەڕێی مەرگم دەکرد. یەك یەك ئێمەیان بۆ بەردەم دادوەر بانگ دەکرد. وەکو ئاژەڵی دڕندەلەقەفەزی ئاسنین چاوەڕیی بێدادی بەناو دادوەری بەعس بووین. کەنۆرەم هات سەرۆکی دادگا بەدەم ناو خوێندنەوەوەسەیرێکی منی کرد و دووبارەسەیرێکی فایلەکەی بەردەستیکرد. ماوەیەك قسەی نەکرد. دواتر بەبێ سەر بەرزکردنەوەوتی:

بیبەنەدەرەوە!!!

بەڕاستی هیچ تێنەگەیشتم و لەدڵی خۆم گوتم:

حزبی بەعسەو هەموو شتێکی لێ دەوەشێتەوە. لەوانەیە هەر بەبێ دادگایی لەسێدارەم بدەن. بە تەمای خوای. خوایەخۆم دایەدەستی تۆ. من نازانم و تۆ دەزانی. چی بۆ دین و دونیام باشەئەوە بکە. خوایە گیان خۆت ئاگاداری، بەبێ قسە، بەبێ ئەوەی مەودام بدەن بەرگری لەخۆم بکەم منیان خستە دەرەوەی دادگا. خوایەگیان بەهاوارم بگە. من بەندەی بێ دەسەلاتی تۆم. لەم شارەغەریبەو بەدەست ئەم زاڵمانە لەتۆ زیاتر هیچ پشت و پەنایەکم نیە.

لەو کاتەدا دوو پاسەوانی دادگا هاتن و منیان بەقۆڵ بەستی بردەبەردەم دادوەر. کە لە بەردەمی ڕاوەستام یەکسەر بەزمانێکی شیرین گووتی:

چۆنی کوڕم؟ باشی؟

لە تاو ئەم هەڵوێستەهیچم بۆ نەگوترا. لەناکاو لەجێی خۆی هەڵساو بەرەو لای من هات و دەستی لەسەر شانم دانا. منیش گوتم:

زۆر سوپاست دەکەم، پەنا بەخوا.

سەیری ناو چاوانمی کرد و گووتی:

نامناسیەوەکاکە؟

گوتم: ببورەگەورەم.

گوتی: لەهەموو ماڵی دونیا تاکە کچێکم هەیە.

گوتم: خوا تەمەنی درێژ بکات.

گوتی: بەیانیەك لەگەڵ شوفێرەکەما بەرەو کۆلێژی پزیشکی بەڕێکەوت، بەڵام قەدەری خوای وابوو کەتووشی پێکدادانێکی ترسناك بوون و شوفێرەکەگیانی لەدەستدا.

گوتم: لاحول ولا قوە الا باللە. خۆ کچەکەت سەلامەت بوو؟

گوتی: بەڵێ بەپشتیوانی خوا و هەوڵەکانی تۆ.

گوتم: من؟؟!!

گوتی: بەڵێ. بیرت چووەڕووداوەکەی ئۆتۆمبێلی ڕیگای (بەغدا) بەر لەچەند ساڵێك؟

لەو کاتەسەرجەم ڕووداوەکەم بیرهاتەوە. گوتم:

خوای گەورەبەمیهرەبانی خۆی کردی و من تەنها هۆکار بووم.

گوتی: باشە، پێم بڵێ بۆ ئەو کارەت کرد؟

گوتم: لەڕاهی خوا.

گوتی: دەنا منیش لەڕاهی خـوا و لەبـەر خـاتری تـۆ حـوکمی ئەم (١٤) کەسەی لەگەڵت کەم دەکەمەوە.

گوتم: من ئەوان ناناسم.

گوتی: تۆ کچی منت دەناسی کاتێ بەم کارەهەڵسای؟

گوتم: نا. بەڵام من یەکێك لەئامرازەکانی پەروەردگار بووم بـۆ ڕزگارکردنی ئەم کچەبەستەزمانە.

گوتی: دەنا منیش ئەمڕۆ دەبمەئەم هۆکارە. بڕۆ کـوڕم. خـوا سەربەرزی دونیا و قیامەتت بکات.

پاسەوانەکان هیچ مەودای قسەیاخـود سوپاسگوزاریان نـەدام و منیان بردەدەرەوە. بردمیانە زیندانەبـچوکەکەی دادگـا و دواتـر دووبارە پەلکێشیان کردم بۆ ناو دادگـا. سـەرۆکی دادگـا بـڕیاری دادگایـی خوێـندەوەکەسەرجەم ئـەو تـۆمەتانەی خراونـەتە پـاڵـم ڕاست نـیــن و هــەڵبەستراون و نابـێــت جیـاوازی نەتەوایـەتی لـە نێوان سەربازاندا هەبێت کـە هـەموو لـە بـەرەی جــەنگ خزمـەتی نیـشتمان دەکــەن. دواتـر دوای خوێـندنــەوەی چـەنــد بڕگەیـەك بـڕیاری دەستبەجێ ئـازادکردنمی دەرکرد.

دوای خوێندنەوەی بڕیارەکەسەیرێکی ناو چاوانمی کرد، لەمیانەی ئەم نیگایەسوپاسگوزاریەکی بێ پایانم خوێندەوە. منیش بەهەمان شێوەبەبێ دەنگ سوپاسێکی زۆرم کرد.

سەبارەت بەئەوانەی لەگەڵمدابوون، ئەو (١٤) کەسە کەسیان لە سێدارەنەدران. کەمێکیان ئازاد کران و هێندێکی دیکەحوکمی سووکیان بۆ دەرچوو. جەنابی دادوەر پەیمانەکەی خۆی بەجێهێنا.

ئێمەیان گەڕاندەوەبەندیخانەی ئیستخباراتی سەربازی و دوای دووڕۆژ ئازادیان کردم.

دوای ئازاد کردنم یەکسەر چومەنزیکترین مزگەوت، دوو رکات نوێژم کرد و سوجدەی سوپاسگوزاری و شوکرم بۆ پەروەردگار برد و گوتم: زۆر سوپاس میهرەبانی گەورە، خۆت حاکم و دادوەر و جیبەجێکاری. هیچ شتێك لات ون نابێت. تەنها تۆ شایستەی پەرستنی پەروەردگارە میهرەبانەکەم.

لەوکاتەی کە چاوم بە دنیاوە هەڵێناوە هەر نەداریم بینیوە، کە لە خانەوادەیەکی هەژار، دوای (٦) کچ هاتوومە دونیا هەر بۆیە باوانم بە تاقانە ناویان دەبردم. لەوانەیە ئەم جیاکاریە لە خانەوادەیەکی خوا پێداوی دەوڵەمەند نیعمەت بێت بۆ مرۆڤ کە هەر لەدوای چاو هەڵهێنانی کەوچکێکی زێر دەخرێتە دەمی.

کەچی بۆ حاڵەتی من ناڵێم نیقمەت بەڵام ئەرکێکی قورس و بەرپرسیاریەتیەکی زۆر گەورە بوو. هەر بۆیە ناویان نام شوان چونکە دوای باوکم دەبوایە من بەرپرسی ئەم خێزانە گەورە بوومایە.

لەبەر ئەم ئەرکە قورسە هەر زوو بەزوو وازم لە خوێندن هێنا و یارمەتی باوکم دا لە چاندنی ئەو کێلگە کشتووکالیە بچووکەکەی کە لە بناری چیای هەمان بوو، ژیانێك مەمرەو مەژی واتە تەنها دەمانتوانی رزقی رۆژانەی خۆمانی لێی دەرکەین و هیچ داهاتێکی ئەوتۆو پاشکەوتێکی باشمان نەبوو .

کە تەمەنم گەیشتە (٢٠) ساڵی باوانم بڕیاریان دا پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجام بدەم، دەمودەست دایکم کچە خوشکێکی خۆی بۆ خواستم و کەسێکی دیکە هەتا رێز ئەو خانەوادەی کە ئەرکیان بە ملی منەوە بوو منیش لە کارکردن بەردەوام بووم، رۆژ و شەوم دەخستە سەر یەك بۆ ئەوەی بتوانم بژێوی

خێزانەکەم دابین بکەم.

ساڵ هات و چوو کەچی خوای گەورە هیچ منالێکی پێی نەبەخشین، لەگەڵ هاتنی ساڵی چوارەم قسە و لۆمەی خەڵك زیاد بوو هەر کەسە و لە ڕاست خۆیەوە قسەی دەکرد، هەر کەسە و پێشنیازێکی بۆ دەکردم، یەکێك دەیگوت برۆ لای فلانە شێخ، یەکێکی تر دەیگۆت شیری تەگە بخۆوە، یەکێکی تر دەیگوت ژنێکی تر بهێنە، تۆ تاقانەی چۆن دەکرێت وجاغ کوێربێت؟

ئەمە قسەی پیاوان بوو، خۆ ئافرەتان بە پێشنیازی نامۆ و قسە و تەعلیقی ناخۆش خێزانە بەستە زمانەکەمیان هەراسان کردبوو، ئەوە بوو رۆژێکیان خێزانەکەم قسەی لەگەڵ کردم بەوەی ناونیشانی دکتۆرێکی باشی وەرگرتووە لە پایتەخت و باشتر وایە سەردانی بکەین بۆ ئەوەی ئامۆژگاریمان بکات بۆ چۆنیەتی منال بوون. هەر چەندە بیرۆکەکەم پێی باش نەبوو چونکە پەروەردگار خۆی دەدا و خۆی دەبا بەلام لەبەر دڵی ئەو رازی بووم. ئەوە بوو رۆژی دواتر سەردانی دکتۆرمان کرد دوای ئەنجامدانی چەند پشکنینێك، گوتی:

سوپاس بۆ خوا ئێوە هیچ کەموکوڕیەکتان نیە، بەلام پێویستیتان بە تۆزێك رێنمایی و چارەسەری سادەیە، پەنا بەخوا سەرجەم کێشەکانتان چارەسەر دەبێت.

ئەوە بوو سەرجەم داو دەرمانەکـەمان وەرگـرت و گەڕاینـەوە گوند، لەسەر رێنمایی و چارەسەرییەکان بەردەوام بووین. لە پاڵ هـەموو ئـەو شـتانە بـەردەوام لـە خـوای گـەورە دەپاڕامـەوە کـە منالێکی ژیکەلەم پێی ببەخشێت، بەردەوام دوعای ئەوەم دەکـرد کـە بـە تـەنیا جـێم نـەهێڵێت، لـە سـەرجەم نـزا و پاڕانـەوەکانم دەمووت (رب لاتذرني فردا و انت خير الوارثين).

ڕۆژ هات و چوو لە ناکاو باری تەندروستی خێزانم تێـك چـوو، ئـەوە بـوو بـە پەلەپـەل گەیاندمانـە پایتـەخت و چـووینەوە لای دکتۆرەکەی خۆمان و دوای پشکنین، بە زەردەخەنەوە گوتـی:

پـیرۆزە کـاك شـوان خێزانـت دوو گیانـە، بـەڵام دەبێـت لـە ماوەی داهاتوودا ئەو رێنماییی و چارەسەرانەی بۆتانی دەنووسـم پێبەپێ جێبەجێی بکەن.

دکتۆر کۆمەڵێکی زۆر داودەرمانی گران بـەهای نووسـی بـەڵام لە خۆشیان گوێم پێـی نـەدا و سـەرجەمیانم کـڕی و بەخۆشـیەوە گەڕاینـــەوە لادێ. لەســـەر چارەســـەر و رێنماییـــەکان بـــەرداوەم بووین.

لەسەر کارەکانی خۆم بەردەوام بووم و بیرم لەوە دەکـردەوە کە زیاتر خۆم ماندوو بکەم بۆ ئەوەی بە باشترین شێواز پێشوازی لە رۆڵە خۆشەویستەکەم بکەم. لە لایەکی دیکە لە نزا و پاڕانـەوە

و سوپاسـگوزاری پـەروەردگار نەوەسـتام، بـەردەوام دەسـتی پارانەوە و سوپاسگوازاریم بەرەو ئاسمانەوە بەرز بوو.

کاتی منالّ بوون نزیك بۆوە، دۆخـی خێزانەکـەم هـەر خـراپتر دەبوو تا دواجاتر چوینەوە دکتۆر، ئەویش گوتی:

کاکـە شـوان بـارودۆخی هـەردووکیان زۆر خراپـە، پێویـستە بەنەشتەرگەری منالّەکە لەدایك بێت چونکە ئەگەری لەدەستدانی هەردووکیان لە ئارادایە.

من بـەو قـسەیە زۆر نیگـەران بـووم نـەوەك هـەر لەبـەر بـاری تەندروسـتیان بـەلاّم لەبـەر ئـەوەی مـن توانـای دابینکردنـی خەرجییەکانی نەخۆشخانە و نەشتەرگەرییەکەم نەبوو. گوتم:

دکتۆر زۆری ئەم نەشتەرگەرییە تێ دەچێت ؟

گووتی: هیچ نیە، نزیکەی (٥) ملیۆن.

لەدڵی خۆم گووتم ئـاخر دکتـۆر بـۆ ئێـوە هـیچ نیـە دەنـا بـۆ جووتیارێکی بێ سەوادی بناری چیا (٥) ملیـۆن وەکـو سـامانێکی گەورە وایە، ئاخر کاك دکتۆر منێك کە رۆژانـە بـژێوی ژیـان پەیـدا دەکەم لە کوێ (٥) ملیۆن بێـنم؟؟!! منێـك کـە ئـەو رۆژەی کـار نەکـەم ئەسـتەمە بتـوانم خـەرجی رۆژەکـەم دەرکـەم، منێـك لـە پەروەدگار دەپارێمەوە نەخۆش نەکەوم چونکە پارەی نۆرینگەی دکتۆر و داو و دەرمانم نیە، منێك کە نەداری لە منالیەوە یەخـەی

گرتووم و تا ئێستا خێرم لە خۆم نەبینیەوە، لە کوێ ئەم برە پارە بینیم؟ ئاخر (٥) ملیۆنەکەی تۆ داوای دەکەیت بۆ جووتیارێکی کەساس وەکو من (٥) ملیۆن دۆلارەو بۆ تۆ ئاساییە! کە لەوانەیە تۆ کەسێك هەبێت بەقەرز پێتی بدات، کەچی من ئەو کەسەشم نیە کاکی دکتۆر.

کاکی دکتۆر من زۆر بە نەرمی مامەڵە لەگەڵ زەوی دەکەم و بەدایکی خۆمی دادەنێم کاتێ بە گاسن و ورگی هەڵدەدرم، لە پێناو بەروبوومی نوێ و چاندنی زەوی و دەرکردنی خێروبێری ناخی کاکی دکتۆر. من وەك نەخۆشێك مامەڵەی لەگەڵ ناکەم کە تەنها رەچاوی بەرژەوەندی خۆم بکەم و زگی نەخۆش بۆ بڕێك پارە هەڵبدرم، من بە هیوای ئەوەم ئادانو بە پیت بێتو هەمووان سوودی لێ ببینن نەوەك هەر تەنها خۆم سوودی لێ وەربگرم.

ئای کاکی دکتۆر.....

ئەگەر ئێوەش، وەکو من چۆن مامەڵە لەگەڵ زەوی دەکەم، ئاوا مامەڵەکەتان لەگەڵ نەخۆشتان کردبا ئێستا ئەم وڵاتە دەبووە گوڵزار.

ئەم ئێوارە کاتی نۆرینگەی دکتۆرم جێهێشت بیرم هەر لای چۆنیەتی دابینکردنی ئەم برە پارەیە بوو. خۆ کەس نیە ئەم

بـڕەم بـە قـەرز بـداتی، خـۆ ئەگـەر هەشـبا چـۆن دەمتـوانی بیدەمەوە، هیچ شتێکیش شك نابەم بیفرۆشم و (٥) ملیۆن بکات. ئەی خوایە گیان دەبێ چی بکەم .... خودایە هاوار!

لەم ماوەیەدا دەسـتم لـە نـزاو پاڕانـەوە هەڵنـەگرت، بـەدزی دوور لە چاوی خێزانەکەم زۆر بەکوڵ دەگریام، ئـاخر چـوار سـاڵە چاوەڕێی ئەم منداڵەم و ئێستاش ناتوانم پارەی لەدایکبوونی دابین بکەم، ئاخر دواتر چۆن دەتوانم بەخێوی بکەم!!؟

ڕۆژ بـە ڕۆژ تەندروسـتی خێـزانم خـراپتر دەبـوو، لـە ڕۆژی نەشـتەرگەری نـزیکتر دەبووینـەوە، ڕۆژێکیـان بـە تـەواوی بـاری تەندروستی تێك چوو، بە مۆبایل لەگەڵ دکتۆر قسەم کرد و گوتی هەر ئێستا بیهێنە نەخۆشخانەی تایبەت، منـیش خـۆم لـەوێم. بـە پەلەپەل کەوتینە خۆ و خۆمان کۆکردەوە. من چەند سـەرم هێنـا و برد، پارەم لە باوکم قـەرز کـرد، کـە چـی هـەر نەگەیشتە یـەك ملیۆن، بەهەر حاڵ بە خێرایی بەرەو پایتـەخت لەگـەڵ هاوسـەر و دایکم بەڕێ کەوتین. هاوسـەرمیان خەوانـد و دایکیـشمیان لەگـەڵ هێشتەوە. دکتۆر گوتی:

تا باری تەندروستی جێگیر نەبێت نەشتەرگەری بـۆ ناکـەین، و سبەی دانی بەیانی انشاء الله ئەنجامی دەدەیـن، تـۆ دەتـوانی بڕۆیتەوە .

زۆر بــه خــەمباری گەڕامــەوە و نەمــدەزانی چــیبکەم، دوای نوێژی شێوان دەستم کردەوە نزا و پاڕانەوە:

پەروەردگار لە تۆ زیاتر کەسم نیـە، خۆت هــەموو شتێکت نووسـیوە و داتنـاوە. منێـك کـە هـەر لـە رۆژی لـە دایکبوونمـەوە تاوەکو ئێستا کار دەکەم و بە هیچ نەگەیشتم، کەچی هەر رازیم و لای کەس گازەندەم نەکردووە. ئەمشەو هاتوومەتە قاپیت و لێت دەپاڕێمـەوە، دروسـتکەری هـەموو جیهـان بـە هانـام بگـە، مـنی بەنـدەی بێکـەس لـەدەرگای خـوای هـەموو جیهـان دەدەم. کـار ئاسانیم بۆ بکە، دەزانم کاتی مـوعجیزە و کـەرامات نـەماوە و مـن کەسێکی ئەوەنـدە بـاش نـیم، بـەڵام هانـام بـۆ تـۆ هێنـاوە، تـۆ فریادڕەسی هەمووانی، بەفریام کـەوە پـەروەردگار، ئـەی کەسـی بێی کەسان، پاشای زەمین و ئاسمان. بەهانام بگە.

زۆر گریام، زۆر پارامەوە و لەسەر دووگردەکە خەوم لێکەوت.

بەرەبەیانی بەدەنگـە دەنگێکـی زۆر هەڵسام کـە لـە کـۆلیتی مریشکان، کە هەر دەنگی قیڕاندن و شەقەی باڵ دەهات.

بەپەلەپــەل بــەرەو لای کولیتەکــە رۆیــشتم نــەوەك رێــوی چووبێتە ناویان. بەڵام کە سەرم بـە کۆلیتەکـە داگـرت، لـە تـاوی دیمەنەکـە دۆش دامـام، کـاتی بینـیم بازێـك خـۆی خـستۆتە نێـو مریشکەکان و هەر باڵە فڕکەیـەتی بـەڵام ناتوانێـت دەرچـێت، زۆر

به ئاسانی گرتم، سەرم بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە و گوتم:

زۆر سوپاس خوایە گیان لەسەر ئەم بەخشینە.

لەدڵی خۆم دەمگوت هەر چەند بکات گرنگ گرنگ ئەوەیە تۆزێك پارەم دەست کەوێت.

کاتی بازەکەم هێنایە بەر رووناکی بینیم شێوەی زۆر جوانە، لە دڵی خۆم گوتم:

با هەزار دۆلاریش بکات هەر مەمنونم.

دوای نوێژی بەیانی باوکمم و خزمانم لە مەسەلەکە ئاگادارکردەوە، کە بازێکم لە ناو کۆلیت گرتووە.

نا.... نەخێر خوای پەروەدگار بە دیاری بۆی ناردم.

یەکێك لە ئامۆزاکانم پەیوەندی پێوەکردم و دوای وەسفکردنی شێوازی گوتی:

کاکە مەیفرۆشە تا من دێم، وابزانم پارەیەکی باش دەکات، پەیوەندی بە خەڵکانێك دەکەم کە کاری دەلالی بۆ خواپێداوەکانی کەنداو دەکەن، و ئەم جۆرە بازانە بۆ ڕاوکردن دەکڕن، پەلە مەکە تا من هەواڵت دەدەمەوە.

کڕنۆشێکی سوپاس گوزاریم بۆ پەروەردگار برد و یەکسەر هاوسەرەکەم بیر هاتەوە، پەیوەندیم بە دایکم کرد و گوتی:

کوڕم پەلە مەکە نەشتەرگەریەکەیان بۆ ئێوارە دواخست، لە

هیچمان کەم نیە و خۆت ئەزیەت مەدە و جاریّ مەبیی.

دووبارە لەگەڵ ئامۆزاکەم خەریکی وەرگرتنی کۆتا نرخ بووم بۆ بازەکە، ئەوە بوو یەکێك لە دەوڵەمەندەکانی کەنداو، یەکێك لە بریکارەکانی خۆی لە پایتەختەوە نارد، ئامۆزاکەم گووتی:

کاکە تۆ هیچ قسەیەك مەکە بۆ منی جێبێلە.

منیش لەدڵی خۆم هەر هاواری خوام دەکرد .

بریکارەکە بەجوانی سەیری بازەکەی کرد و دوای تێرامان گووتی:

لە دوو زیاتری پێی نادەم.

ویستم بلێم: دوو وەرقە؟

ئامۆزاکەم نەیهێشت قسە بکەم و گووتی:

چەند؟ دوو کەم نیە؟

بریکارەکە گووتی:

بەخوای لە دوو دەفتەر زیاتر ناکات.

لە دڵی خۆم گوتم دوو دەفتەر یەعنی بیست هەزار دۆلار.

خوایە زۆر سوپاس لە کەیفان لە خۆمەوە گووتم:

وابزانم ئەم جۆرە زیاتر دەکات.

کەچی بریکارەکە گوتی: کاکە ئەمە کۆتا نرخە، ناتانەوێت دەرۆم، ئەوەی دەیکرێت خێری لیّ ببینیّ.

له تاوان گوتم: بەخوای نارۆی، هی تۆیە و خێری لێ ببینی.

بازەکەم پێدا و پارەکەم وەرگرت، سەرەتا شیرینی ئامۆزاکەم داو، دواتر یەکسەر بەرەو هەولێر بەرێکەوتم، بەر لەوەی بچمەلای هاوسەرەکەم لە ژمێریاری نەخۆشخانە پارەی نەشتەرگەرییەکەم دا.

ئێوارەی هەمان رۆژ پەروەردگار کورێکی جوان و قشتی پێ بەخشیم .

رۆژی دواتر لەگەڵ دایك و هاوسەر و کورە چاوگەشەکەم گەڕاینەوە گوند و قوربانییەکی گەورەم کردە خێر. هەموو خەڵکی گوندم بانگهێشت کرد بۆ خوانی نیوەرۆ. دواتر برێکی باشی پارەم بەسەر هەژاراندا دابەشکرد.

بۆ شەو کرنوشێکی سوپاس گوزاریم بۆ پەروەردگار برد و گوتم :

پەروەردگارە میهرەبانەکەم زۆر سوپاس بۆ ئەو بەخششە بەنرخەت، منێك کە لەبەر دەستکورتی و نەداری کێشەیەکی گەورەم هەبوو هانام بۆ هێنای، تۆی گەورە سەرجەم کێشەکانمت لە ڕێگای تەیرێکی بچووکەوە چارەسەرکرد، کە ناردتە ناو کۆلیتی مریشکەکانم.

زۆر سوپاس پەروەردگارە میهرەبانەکەم.

بەردەوام گەڕەکە میللییەکان شانۆی ڕووداوی ناخۆش و تراژیدیا و کارەساتەکانن. وەنەبێ ئەم ڕووداوانە هەر بەهۆی هەژاری و نەدارییەوە بێت، بەڵکو لەبەر ئەوەی نەزانی و کلتوری دواکەوتووی کۆمەڵایەتی ڕەگی لەم ناوچانەدا کوتاوەو یاری بە ژیان و چارەنوسی مرۆڤەکانەوە دەکات.

چیرۆکی ئەم جارەمان لەسەر خانەوادەیەکی هەژاری یەکێك لەم گەڕەکانەیە کە لە باوان و دوو منداڵ پێك دەهات، کوڕی گەوەرە تەمەن (١٥) ساڵ، کە وەك باوکی کەسێکی بێ کەڵك و ناگوێڕایەڵە، کە لە هەموو شتێك هەرەسی هێناو تەنانەت قوتابخانەشی جێهێشتبوو و، کوڕێکی بچووك کە تەمەنی (٥) ساڵان بوو، جارێ نەچووبووە قوتابخانە .

باوکەکە کرێکار بوو، بەڵام کەسێکی خوانەناس و تەماحکار و خۆپەرست بوو، لەبەر ئەنجامدانی فرت و فێل و نادڵسۆزی لە کاردا، کەس نەی دەبردە کارکردن، کەچی بەپێچەوانەوە خێزانەکەی پێچەوانەی ئەو ئافرەتێکی باش و دڵپاك بوو، هەر خەریکی کاری ماڵەوە بوو، لەگەڵ ماڵ و مێرد و منداڵەکانی زۆر باش بوو .

زۆر شوكر بوو هاوسەرەكەی هەرچی هێنابەیەوە بە ڕەزامەندیەوە دەرخواردی منالّەكانی دەدا.

بە پێچەوانەوە هاوسەرەكەی زۆر خراپ بوو و بەردەوام بە خراپە مامەڵەی لەگەڵ دەكرد، تەنانەت چەند جارێكیش دەست درێژی كردبووە سەری و دوای ئەشكەنجەدانی دەری كردبووە ماڵی باوكی، هەڵەی ئەم ئافرەتە بەستەزمانە لەوە دابوو، بەناوی پاراستنی شیرازەی خێزانەكەی و خۆشنەكردنی دڵی خەڵك و پارێزگاریكردن لە منالّەكانی، بەرگەی هەموو ئەو خراپە كارییانەی دەگرت هیچ كاردانەوەیەكی نەبوو.

خێزان دروستكردن بریتیە لە هاوبەشیەك لە نێوان دوو مرۆڤ كە هەردووكیان هەمان ئەرك و مافیان هەیە و وەكو دووباڵی باڵندەیەك وان، چەند لەگەڵ یەك باشبن و لێك بگەن و یەكتریان خۆش بوێت، ئەوا چارەنووسی ئەم خێزانە بەرەو ئاسمانەكانی ئاسوودەیی و كامەرانی دەفڕێت.

بە پێچەوانەوەش كاتی ئەم دینامیكەی باڵەكان بەهۆی لێك نەگەیشتن و تێك نەگەیشتن تێك دەچێت، ئەوا شیرازەی ئەم خێزانە تێكدەچێت و زوو یان درەنگ پێویستە ئەم باڵندەیە بنیشێت و هەردوولا بەخۆیان بچنەوە و هەڵوێستەكانیان چاك

بكەنەوە، دەنا رووداوەكان بە ئاراستەیەكی خراپەوە دەڕۆن و لایەنێك بە قورسی باجەكەی دەداتەوە.

بەیانییەك دوای دەرچوونی باوك بۆ كاركردن، كوڕە بچكۆلانەكە بەمەبەستی كرینی شیرینی دەچێتە دوكانەكەی سەری كۆڵان، بەڵام لە كاتی پەڕینەوە لە شەقام ئۆتۆمبێلێك لێی دەدات، شوفێرەكە دەست بەجێ منالّە زامدارەكە دەگەیێنێتە نەخۆشخانە، بەڵام بە هۆی سەختی زامەكانی گیان لەدەست دەدات و شوفێرەكەش دەستگیر دەكرێت .

باوكە تەماحكارەكە ئەم هەڵە دەقۆزێتەوەو هەر چەندە لە كوردەواریدا منالّی بچووك پرسەی بۆ دانانرێت، كەچی پرسەیەكی گەورەی سێ رۆژەی بۆ دادەنێت و خانەوادەی شوفێرە دەستبەسەرەكەش هەر سێ رۆژ لە گەڵیان دەبن .

دوای هەفتەیەك لەم رووداوە خانەوادەی شوفێرەكە بە یاوەری كۆمەڵێك لە پیاو ماقول و ریش سپیان سەردانی دەكەن بۆ رێكخستنی رێكەوتنی هەردوولا لەسەر ئازادكردنی شوفێرەكە و بڕی ئەو پارەیەی پێویستە ئەوان بیدەن لە بڕی خوێنی كورەكەی .

باوکی چاو برسی داوای بڕە پارەیەکی زۆر دەکات بەشێوەیەك دانیشتووانی هەموو تووشی سەرسورمانکرد و لە ئاستیدا هیچیان پێی نەگوترا، لەبەر هەڵوێست و قسە ناشایستەکانی، دوای ئەم دانیشتنە و لە رێگای برادەرانو دۆست و خزمان برازاڤێکی گەورەی دڵ نەرم کردنی باوکەکە دەستپێکرد بەڵام هەموو هەوڵەکان لە ئاست ئەم مرۆڤەدڵ بەردینە شکستیان خوارد، بەردەوام دەیگووت: مادامەکی پارەی نیە با منالی خەڵك نەشێلێت.

من یەك فلس خۆش نابم .

کێشەی خۆیەتی چۆن پارە پەیدا دەکات.

خێزانە جگەر سووتاوەکەی زۆر بە هێمنی قسەی لەگەڵ کرد و پێی گوت:

پیاوەکە ئەوە ویستی خوایە، قەزاو قەدەرە، خوای گەورە ئەم منالەی پێ بەخشین و هەر خۆشی بردییەوە، ئێستاش کورێکی دیکەمان هەیە و ئێمەش ئەوەندە گەورە نین تا منالی دیکەمان نەبێت.

لە خەڵك ببورە بەڵکو خوای گەورە لێمان دەبوورێت.

دەرگـای زینـدانی لێبکـەوە بـەڵکو خـوای گـەورە دەرگـای خێروخۆشی کامەرانیمان لێ دەکاتەوە.

کەچی پیاوەکە زۆر بە خراپی قسەی پێ دەبڕێت و دەڵێت:

تۆ هیچ مافێکت بەسەر ئەم مەسەلەیەوە نیە، من باوکیم و خۆم بڕیار دەدەم، کەسیش ناتوانێت شەکر بشکێنێت و ئامۆژگاریم بکات، جارێکی دیکەش ئەم بابەتەم لەگەڵ باس نەکەی .

دوای شکستهێنانی سەرجەم هەوڵەکانیان، ناچار شوفێرەکە هەڵدەستێت بە فرۆشتنی خانوو و ئۆتۆمبێل و قەرزکردنی برێك پارە، ئەمە جگە لەو کۆمەکیەی کە لە لایەن خزم و دۆستانەوە بۆی کۆ کرایەوە.

ڕۆژی دوا دانیشتن باوکی شوفێرەکە پارەکەی بۆ دەبات و دوای باس کردنی شێوەی کۆکردنەوە بڕەکە پێی دەڵێت:

بە گەورەیی خۆت لە کوڕەکەم ببەخشە، ئێستاش دەکرێت بڕێکی لێخۆشبیت.

کەچی ئەو بە شێوەیەکی زۆر خراپ وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت:

باشه تۆ بەشێك لە ژیانی کوڕەکەم بۆ بگەڕێنەوە، تا منیش بەشێك لە پارەی کوڕەکەت خۆش بم! مامی خۆم پارەکەت دانێ و برۆ کوڕەکەت فێری سەیارە هاژووتن بکە.

باوکی شوفێر دەڵێت:

زۆر راستە، سوپاس بۆ ئەم ئامۆژگارییە، دەچم کوڕەکەم فێرە شوفێری دەکەم، بەلاّم کێ تۆ فێرە مرۆڤایەتی و ئەخلاق و رەوشت بکات؟ کێ تۆ فێر بکات کە ماڵی دونیا بە دوو جۆر بۆ مرۆڤ دێت بە نیعمەت و نیقمەت. ئەوە پارەکە، بەلاّم یاخوا خێری لێ نەبینی! گومانم لەوەدا نیە، کە چۆن ماڵی کورەکەمت تێکدا، ئاواش ماڵت تێك دەچێت. خوا پشت و پەنای خێزانە بەستەزمانەکەت بێت.

بۆ رۆژی دواتر، باوکی چاوچنۆك خێزانی برد و سەردانی بنکەی پۆلیسی کرد و لەسەرجەم مافەکان خۆش بوون، دوای تێپەربوونی دوو هەفتە خانوێکی لە دەرەوەی شار، بەبەشێك لەپارەکە کڕی.

خێزانەکەی زۆر بەم کارە عادز بوو و گوتی::

بۆ لە ناو شار نەتکڕی؟ خۆ ئێمە دوای وەرگرتنی پارەکە ئەو توانایەمان هەبوو؟ من هەرگیزاوهەرگیز نایێمە ئەم خانووە، لێرە دەمێنمەوە؟

کابرای دڵڕەق زۆر بە شێوەیەکی ناشایستە و لەبەردەم کورەکەی لە خێزانە بەستەزمانەکەی دا و دەری کردە دەرەوە .

ئەم بەستەزمانەش هەمدیس بە چاوی پڕ لە گریانەوە چۆوە ماڵی باوکی.

کە شەو داهات کورەکە گلەیی لە باوکی کرد و گوتی:

باوکە گیان بۆ ئەوەندە لەگەڵ دایکم خراپی؟ بەردەوام ئەشکەنجەی دەدەی؟ ئەو هیچ بەرپرس نیە لە مردنی براکەم .

باوك: کورم مەسەلەکە وا نیە، من رقم لێیەتی و حەزناکەم بیبینم، هەر چەند دەری دەکەم هەر دێتەوە.

کوڕ: ئاخر ئەو نایەوێت شیرازەی خێزانەکەمان تێك بچێت .

باوك: قسەی قۆڕ، باشە بۆ تۆ نایێی بە قسەم بکەیت؟

کوڕ: سەبارەت بەچی باوکە؟

باوك: بە هەر شتێ کە داوات لێبکەم، دەزانم تۆ زۆرت حەز لە ئۆتۆمبێلە تا لەگەڵ هاورێکانت بچیتە پیاسە.

کوڕ: ئەریّ وەڵا باوکە گیان.

باوك: دەباشە تۆ کوڕێکی گوێڕایەڵ بە، پەیمان بێت من بۆتی بکرم.

کوڕ: ئاخر تەمەنم (١٥) ساڵە، مۆڵەتی شوفێریم پیّ نادرێت.

باوك: مۆڵەتی چی؟ من بۆتی دەکڕم و من مۆڵەتت پیّ دەدەم کە ئۆتۆمبێل لێبخوری.

کوڕ (بەدەم ماچکردنی دەستی باوکی): باوکە گیان پەیمان بێت لە قسەت دەرنەچم، هەر چیی بڵێی من بیکەم.

باوك: هەرچی بلێم؟ هەرچی بلێم ؟

کوڕ: بەڵی باوکە گیان .

لەم شەودا، دوای وەرگرتنی رەزامەندی دڵی کوڕە تاوانبارەکەی، کابرای بیّ ویژدان سێهەم هەنگاوی لە پلانێکی قێزەوەن پلانێك کە زادەی بیرێکی شەیتانی نگریس بوو.

دوای دوو رۆژ خەزووری کچە کەساسەکەی لەگەڵ خۆی هێنایەوە ماڵەوە و نەیزانی بەدەستی خۆی ئەم کچەی بەرەوە مەرگێکی ناوادە هێناوە، کابرای دڵڕەق بەو مەرجە هاوسەرەکەی وەرگرتەوە کە رازی بێت بەو خانووەی کە لە دەرەوەی شار

کرپویەتی، و هیچی تر قسە نەکات سەبارەت بە هەر شتێك کە پەیوەستە بە ژیانیان، لەمەودوا کوڕ و باوکە بێ ویژدانەکە قسەیان لەگەڵ ئافرەتە بەدبەختەکە نەکرد، دوای ماوەیەکی کورت ماڵیان گواستەوە خانووی نوێ، بەڵام ئەم دابڕانەی نێوانیان هەر بەردەوام بوو.

چەند جارێك ئافرەتەکە ویستی لەگەڵ کوڕەکەی قسە بکات و ئاشتی بکاتەوە، بەڵام بێهودە بوو، بۆیە ژیانێکی ناخۆشی بەسەر دەبرد، لە خانوێکی نوێ کە کەس لە دراوسێکانی ناناسێت، مێرد و کوڕێکی دڵرەق کە تەنانەت قسەشی لەگەڵ ناکەن.

دوای ماوەیەك هەردوو بێ ویژدان کەوتنە گفتوگۆ بۆ پیلان دارشتن دژی ئافرەتێك کە هاوسەری یەکێك و دایکی ئەوەی تریانە، تەنها تاوانی ئەوەیە کە بۆتە بەربەستێك لەبەردەم گەیشتنی هەردوو نامرۆڤ بە لەیلانێك کە بەدیدی ئەوان بەهەشتی چاوەروانکراوە، کەچی بەدۆزەخکردنی ژیانی ئەم پاکیزەیە دێتە ئاراوە .

باوك: کورم بەیانی دەچینە پێشانگای ئۆتۆمبێل، هەرچی بە دڵی تۆیە ئەو دەبێت، کامە جۆرت ویست ئەوا بێ چاو تروکاندن دەستنیشانی بکە .

کوڕ: باوکە بەڕاستیتە؟ زۆرم خۆشدەوەییّ! دەبی کەی بەیانی بێت تا بچینە ئەویّ؟

ئەمشەوی کورەکە لە خۆشیان خەوی لێی نەکەوت، کاتی بەیانی هات هەردووکیان چوونە پێشانگا، کورەکە وەکو هەنگێکی سەرشێت ئەم ئۆتۆمبێلەی واز لیّ دەهێنا و دەچووە سەر ئۆتۆمبێلێکی تر.

لە کۆتاییدا یەکێکی بەدڵ بوو، بە باوکی گوت:

دەترسم نرخی زۆر بێت.

باوک گوتی: هەر چەند بێت تۆ مافت بەسەریەوە نەبێت.

کوڕ: یەعنی بۆمی دەکڕی؟

باوک: بەڵیّ من نرخی ماددی دەدەم، تۆش بەشی خۆت دەدەی.

کوڕ: بەشی خۆم؟ تێناگەم!

باوک: بەڵی من ئۆتۆمبێلەکەت بۆ دەکڕم، تۆش دایکت دەکوژی....!!

کوڕ: چی.. چی..؟؟!! چۆن باسی شتی ئەوهام لەگەڵ دەکەی؟

باوك: زۆر باشە. دەنا بابچینەوە ماڵەوە و بۆ خۆت بڕۆ ئۆتۆمبێل بکڕە .

هەردووکیان بەبێ ئەوەی یەك وشە لەگەڵ یەك قسە بکەن گەڕانەوە ماڵەوە، پیاوەکەش بەردەوام بیانووی بە هاوسەرەکەی دەگرت و ئەشکەنجەی دەدا.

زۆر سەیرە! کاتێ مرۆڤ دەزانێ هاوکێشەی ژیانی تێك چووە و ڕێگاکان گەیشتوونەتە بنبەست، کەچی هەر بەبیانووی جۆراوجۆر بەردەوام دەبێت و دڵی خۆی ڕازی دەکات!..

دایکە کەساسەکە بەهەمان شێوە خۆی بەدوا ڕۆژی ڕازاوە و وەهمی چاکبوونی هاوسەرەکەی و لەیلان و سەرابی تێکنەچوونی شیرازەی خێزانەکەی لە ماڵ مایەوە و نەیدەزانی بە پێی خۆی هاتۆتە لانەی مار و زوو یان درەنگ دەبێت باجی ئەم ساویلکەیی و خۆش باوەڕیەی بداتەوە.

دوای تێپەڕبوونی کەمتر لە هەفتەیەك، کوڕە لاسارەکە چووە لای باوکی و ڕەزامەندی خۆی نیشاندا بە کوشتنی دایکی لە پێناو بەدەستهێنانی ئۆتۆمبێلێك.

واتە ئۆتۆمبێلەکە ئەوەی دەهێنا کە دایکی خەڵەتانی خۆین بکات، ئەو دایکەی کە نۆ مانگ لە زگی خۆیدا هەڵیگرت و پازدە

ساڵە بەخێوی دەکات، کەچی ئەو تەنها بە دوو ڕۆژ بڕیاری یەکلاکەرەوەی دەرکرد بە کوشتنی دایکی .

هەندێك جار مرۆڤ زۆر لە ئاژەڵ درەندەتر دەبێت!

ئەو شەوە باوك و کوڕ پیلانی لەناو بردنی نزیکترین کەسیان دەکرد، هەرکەسەو لە پێناو ئامانجێك لە پێناو وەهمێك و لەپلانێك، لە پێناو گەیشتن بە خۆشییەك کە ئەم مرۆڤە کەساسە هیچ ڕێگرییەکی بە گەیشتنیان بە ئامانجەکانیان نەکردبوو.

ئەوەی لێرەدا شایەنی باسکردنە ئەوەیە کە هاوسەری بێ ویژدان ماوەیەك بوو پەیوەندی لەگەڵ ئافرەتێك بەستبوو، بەو نیازەی مارەی بکات، بەڵام ئافرەتەکە مەرجی سەرەکی ئەوە بوو کە ئەو لە خێزانی جیا بێتەوە، ئەوجا ڕازی دەبێت. بۆیە بە هەموو جۆرێك هەوڵی دەدا خێزانەکەی دوور بخاتەوە، کەچی ئەو هەستی نەدەکرد یاخود چاکتر بڵێین دەستی بەوەهمی یەکڕیزی خێزانەکەی گرتبوو .

هاوسەری بێ ویژدان پیلانێکی پێنج هەنگاوی لە پێناو دروستکردنی ژیانێکی نوێ داڕشت؛ کە هەنگاوی یەکەم بە وەرگرتنی پارەیەکی زۆر لە بڕی خوێنی کورەکەی دەستی پێکرد، هەنگاوی دووەم بریتی بوو لە کڕینی خانوویێك لە

شــوێنێکی دوور لــە شــار لــە پێنــاو نەناســینیان لەلایــەن دراوسێیەکانیەوە بۆ ئەنجامدانی هەنگاوی سێهەم و چوارەم، کـە بریتی بـوو، لـە لـەناوبردنی هاوسـەرەکەی بەدەسـتی کورەکـەی، بەمـەش هـەردوو بەربەسـت لـە ژیـانی لادەچـێت! ئـیتر هـیچ پەیوەندییەکی بە ژیانی کۆنی نامێنێت. لـە هـەنگاوی پێنجەمـدا ئەو ئافرەتە دەخوازێـت و ژیـانێکی نـوێ لەسـەر کاوڵگـەی ژیانـە کۆنەکەی بنیات دەنێت.

پیلانــی خــۆی گێــڕا.. بــەڵام نــەی دەزانــی کــە چــاوی کــراوەی پەروەدگار هەموو شتێك دەبینێت. پیلانـی ئـەوەی دانـابوو کـاتێ کـە کـوڕە هەرزەکارەکـەی دایکـی خـۆی بـەناوی ناموسپەرسـتی دەکوژێت، ئەوا لە چەند ساڵێك زیاتر بەند ناکرێت، بەمەش ڕێگای بۆ چۆل دەبێت بـۆ هاوسـەر گـیری نـوێ. کاتێـك کوڕەکەشـی لـە زیندان دەردەچێت، ئـەوا ئـەو کـات ئۆتـۆمبیلێکی بـۆ دەکڕێـت و پەیمانەکەشی بۆ دەهێنێتە دی.

بەیانی باوك بە بیانووی کارکردن لە ماڵەوە دەرچـوو، داوای لـە خێزانی کرد کە جلەکانی بۆ بشوات، هاوسەرە بێئاگاکەی پرێمزی لەگەرماوەکە داگیرساند بەمەبەستی ئاو کولاندن بۆ جل شوشـتن، لەم کاتەدا کوڕە بێئەمەکەکەی هەڵسا بە کڕینی دەبەیەك بـەنزین

و خستیه ناو سەتلێکی پلاستیکی. پاشان بەهەنگاوی ئەهریمەن ئاسا بەرەو گەرماوەکە چوو. ئینجا بەنزینەکەی بەدایکی داکرد و یەکسەر دەرگاکەی لەسەر داخست و بەڕاکردن لە ماڵەوە دەرچوو.

ئافرەتی بەدبەخت بەجەستەی داگیرساو بەرەو دەرەوەی ماڵ رای کرد. هەرچەندە لە کۆڵان دراوسێیەکان بە هاواری گەیشتن، بەپەلە ئاگرکەیان کوژاندەوەو بە جەستەیەکی سووتاوی پارچە لێ بۆوە گەیاندرایە نەخۆشخانە، بەڵام بەهۆی سەختی زامەکانی نەتوانرا وتەکانی وەربگیرێت.

دوای چەند رۆژێك گیانی سپارد و لەتەك کوڕە بچووکە خێر لە خۆ نەدیوەکەی لە گۆرستان نێژرا. لەگەڵ دەستپێکردنی لێکۆڵینەوەکان، پۆلیس هۆکاری ڕاکردنی کوڕەکەی لە کاتی رووداوەکە لەبەرچاو گرت! بەم هۆیەوە دەستگیری کرد. کوڕەکە لەبەردەم لێکۆڵەرەوان، دوای ئاشکرابوونی تاوانەکەی، دانی بە کوشتنی دایکی نا، کە گوایە بە هۆی ناموس پەرستی و بە بیانووی ئەوەی پەیوەندی خراپی لەگەڵ چەندین گەنج هەبووەو، لەبەر چاوی ئەم و لە ماڵەوە و لەپشت باوکی کاری خراپی لەگەڵ کردوون...!

دوای ڕەوانەکردنی بۆ چاکسازی نەوجەوانان بە ماوەیەك، باوکی بێویژدان سەردانی کوڕە تاونبارەکەی کرد و لە باوەشی گرت و گوتی:

وەرە کوڕە نازاو بە غیرەتەکەم، سویچی ئۆتۆمبێلێکی لە گیرفانی دەرهیناو گوتی:

ئەوەش دیارییەکەت!

کوڕەکەش گوتی:

زۆر سوپاس باوکە گیان! شەرت بی لە بەردەم دادگا ناوت نەهێنم .

ئەوەبوو دادگا بڕیاری سزادانی بە پێنج ساڵ و مانگێك زیندانی دەرکرد.

بەمەش باوکی تاوانبار وایزانی شانۆگەریەکە تەواو بووە، پەردە داخرایەوە و هەر کەسە و بەرەو ماڵی خۆی ڕۆیشتەوە.

بۆیە دواتر هەڵسا بە مارەکردنی ئافرەتەکە و وایزانی تەواو گەیشتە بەهەشتە چاوەڕوانکراوەکەی، کەچی نەیزانی پەروەردگار مەودا دەدات بەڵام فەرامۆش ناکات.

دوای کەمتر لە دوو مانگ، لەو کاتەی بە یاوەری هاوسەرە تازەکەی، بەو ئۆتۆمبێلە لە شار دەرچووبوون کە سویچەکەی پێشانی کورەکەی دابوو.

لەناکاو ستێرنی ئۆتۆمبێلەکەی لەدەستی دەردەچێت و ئۆتۆمبێلەکەی وەردەگەرێت و گڕدەگرێت، خۆی و هاوسەرە نوێیەکەشی، هەمان ئەو بادە دەنۆشن کە بە نادادپەروەری دەرخواردی دایکە بەستەزمانەکەیان دا. ئەو ئۆتۆمبێلەش دەسووتێت کە کورە تاونبارەکە لە پێناویدا دایکی خۆی سووتاند. ئەوەی مایەی سەرسوڕمان بوو ئەوەبوو کە تەنانەت دوای گیان لەدەستدانی و سووتانی ئەو سەرەی کە ئەو پیلانە بۆگەنەی پێ دارشتبوو، لە جەستە ناپاکەکەی جیا بووبۆوە .

دوای تێپەربوونی سالێك بەسەر رووداوەکە و لەژێر کاریگەری ویژدان، کورە تاوانبارەکە نامەیەك بۆ باپیری (باوکی دایکی) دەنێرێت کە تیایدا دەنووسێت کە زۆر پێویستە بیبینێت سەبارەت بە مردنی دایکی. دوای رەجاو تکایەکی زۆر و لە ژێر فشاری خزمان باپیری چوو بۆ لای. کاتێ نەوەکەی بینی، پێی گوت:

ئەی ناپاك بۆ وات لە كچم كرد؟ ئـەو دایكـە بەشمەینەتـەی كـە تۆی لە سكی خۆی هەڵگرت و پازدە ساڵ خزمەتی كردی!.

كوڕەكە بە گریانەوە گوتی:

بـاپیرە گیـان ... كـاتی دەركـەوتنی راسـتیەكانە. دایكـی مـن بێتاوان بوو، پاكیزە بوو... فریشتەی خـودایی بـوو، مـن و بـاوكم ئەهریمەن و ناپاك بووین.

كاتێـك باوكـە بـێ ویژدانەكـەم پـارەی لـە بـڕی خـوێنی براكـەم وەرگرت، ئاگرێكی هێنایە ناوماڵمان و هەموومانی پێی سـووتاند، ئەوەتا ئەمنیش دوارۆژم سـووتا، تـا مـاوم خێروخۆشـی لـە خـۆم نـابینم. بـاوكم پیلانەكـەی دارشـت. بـە كـڕینی ئۆتۆمبێـل هـەڵی خەڵەتاندم، كەچی ئۆتۆمبێلەكە ئەوی گەیاندە دۆزەخ و ژیانی من و دایكمی كاولكرد.

زۆر پەشیمانم باپیرە گیان... لەم ئازارەی ویـژدان رزگـارم بكـە .... هەموو شـەو دایكـم یەخـەم دەگرێـت ... ئامـادەم لەبـەردەم هـەموو دونیـادا، دان بـە سـەرجەم راسـتیەكان بنـێم... هیـوادارم خوای گەورە لێم خۆشبێت و گیانی دایكم ئاسوودە بێت.

# ناوەرۆك

# Leylan

Leylan

**نووسەر لەچەند دێڕێکدا ...**

* کاروان عەبدولکەریم شێخ عەلی خۆشناو
* لە دایکبووی هەولێر ١٩٧١
* بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە کۆلێژی پۆلیس سالی ٢٠٠٠
* بڕوانامەی دبلۆم لە پەیمانگەی مامۆستایانی هەولێر ١٩٩٢
* لە سالی ١٩٩٢ەوە وەك ڕێپێدراوی لێکۆلینەوە لە پۆلیسی هەولێر دامەزراوە.
* ماوەی ١٥ سال کارکردن لە بواری ڕاگەیاندن.
* چەندین بابەتی جۆرا و جۆری لە ڕۆژنامە و گۆڤار و تۆڕە کۆمەلایەتیەکان بلاوکردۆتەوە.
* ئامادەکار و پێشکەشکاری بەرنامەی (پۆلیس و کۆمەل) بووە.
* بەشداری چەندین خولی جۆرا و جۆری کردوە لە ناوەوە و دەرەوەی ولات.
* لە ئێستادا وتەبێژ و بەرپەسی ڕاگەیاندنی پۆلیسی هەولێرە.



Karwan A.XOŞNAW